# سیدهارتا

رۆمان

هێرمان هیسه
وەرگێڕانی لەفارسییەوە: عومەر سەرگەتی

هسه، هرمان، ۱۸۷۷-۱۹٦۲ Hesse,hermann
سیذارا / هرمان هسه: ترجمه‌امیر فریدون گرگانی .-{تهران}: فردوس، ۱۳۷۳.
عنوان اصلی: Siddhartha

حکومەتی هەرێمی کوردستان

وەزارەتی ڕۆشنبیری

بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێران

xaneywergeran@hotmail.com

- ناوی کتێب : سیدهارتا
- نووسەر: هێرمان هیسە
- وەرگێرانی لە فارسییەوە : عومەر سەرگەتی
- پیتچنین: عومەر سەرگەتی
- دیزاینی ناوەرۆک: زانا کەمال
- بەرگ : ئارام عەلی
- تیراژ: ٧٥٠
- زنجیرە: ٢١١
- چاپخانە: تیشک
- چاپ: چاپی یەکەم
- ژمارەی سپاردن: (٢٠٠٣) ساڵی (٢٠٠٨)

- بەنیان‌و هیراو هۆنیا ... پێشکەشە

# سیدهارتا

## گەڕیدەیەک لەنێوان حەقیقەتو نەمریدا

مێژووی تێرامانو وردبوونەوەو پرسیارکردنی مرۆڤ لەخۆیو جیهانو سروشت، بەتایبەت لەرووی کلتوریەوە، پرۆسەیەکی بەردەوامو هەوڵدانێکی قوڵو ماناداربووە بۆ پشکنینو دۆزینەوەو بەدەسهێنانی ئەو چەمکە پەنهانو گرفتئامێزەی کە پێی دەوترێت حەقیقەت، بەدرێژایی مێژووی ئەفسانەو فەلسەفەو ئاینەکان، خەیاڵی دۆزینەوەی حەقیقەت ئامادەگیەکی بەردەوامی هەبووەو ڕووبەرێکی بەرفراوانی داگیرکردووە لەزەینی گەڕیدەکانی حیکمەتو تێکستی فەیلەسوفەکانداو لەخەیاڵدانی پەیامبەرەکانو ئەفسانەسازە کۆنەکاندا، هەربۆیە لەسادەترین پێناسەکردنی فەلسەفەدا، نکۆڵی لەو ڕاستیە ناکرێت کەئەرکی سەرەکی فەلسەفە، گەڕانو پرسیارکردنە لە ماهیەتی حەقیقەت. بەواتایەکیتر، مێژووی ئاگایی مرۆڤ هەر لەسەرەتاوە، گەشتێک بووە بۆ دۆزینەوەو پشکنینی ئەو ڕێگایانەی کە مرۆڤ وەک گەڕیدەیەکی وێڵو بێخاوەنی ناو ئەم ئەستێرە کۆنە دەبەنەوە سەر نهێنیەکانیحقیقەت. هەربۆیە پرسیارکردن لەماهیەتی حەقیقەت، وزەی ئەو هێزە سیحراویو لەبن نەهاتوەیە کە بەردەوامی دەبەخشێت بەژیانی تێکستە ئەدەبیو هونەریو فەلسەفیەکان، بەمپێیە حەقیقەت، ئەو نهێنیو ئارەزوە بێکۆتاو لەبن نەهاتووەیە کە دەمانبەستێتەوە





بەژیانەوەو ڕاماندەگرێت لەبەردەم ئەو ونبونە هەمیشەییەی خۆیداو بەرامبەر بەهێزە نادیارو کاریگەرەکانی، سەرسامامان دەکات لەئاستی ئاگاییدا. هەروەها یەکەمین هێزی پرسیارکردنە لەبوونو خوداو مرۆڤو گەردون، سەرەتای ڕامانو سەرسامبوونە لەبەردەم جیهانو یەزدانو مرۆڤداو سەرەتای ئەو یەکەمین جمانو خرۆشانەشە کە مرۆڤی بیرکەرەوە دەخاتە ڕێ بۆ گەیشتنو گەڕانو عەودالبوون بەدوای ماهیەتی خۆییو نهێنیەکانی نەمریدا، لێرەوە هەرمرۆڤێک، شێوازو ڕێچکەو دنیابینیەکی تایبەتی هەیە بۆ وێناکردنو تەماشاکردنی سیماو ڕوخسارە جیاوازەکانی حەقیقەت، چونکە هەموو کەسێک دەتوانێو مافی ئەوەی هەیە، کەوێناکردنو خەیاڵو ڕێگاو بیرکردنەوەی تایبەتو جیاوازی هەبێت بۆ گەڕانو پشکنینو پێناسەکردنی جەنگی گەیشتن بەحەقیقەت، مادام هەموو مرۆڤێک مافی بیرکردنەوەو مافی پرسیارکردنی هەیە لەجەوهەری حەقیقەت، کەواتە بەئەندازەی خەیاڵکردنی مرۆڤەکان، جۆرو شێوازی جیاجیای حەقیقەت هەیە. ئەمەش ئەو قسەیەی "نیتشە"مان بیردەخاتەوە کە دەڵێت: "چەند جۆر ڕوانینو وێناکردنمان هەیە بۆ ژیان، ئەوەندەش جۆری حەقیقەت هەیە، کەواتە هەر لەبنەڕەتەوە حەقیقەت بوونی نیە".

لێرەوە ئەو کەسەی بانگەشەی ئەوەدەکاتو پێیوایە حەقیقەت بەتەنها لای ئەوەو بەتەنها خۆی خاوەنیەتی، جگە لەفریودانو خەڵەتاندنی ئینسانەکان شتێکیترنیە، جگە لەوەهمێک لەوەهمەکانی حەقیقەتو توندوتیژیەک لەئارەزووی شەڕانگێزیمرۆڤ، هەڵگری هیچ ئومێدو مژدەیەکی دیکە نیە بۆ ژیان، چونکە ئەو بیرکردنەوەو وێناکردنە تایبەتەی کە "من" هەمە بۆ حەقیقەت، دەشێ لای "ئەویتر"

جۆرێک بێت لەهەڵەو گوناەو تاوانو تەنها ئەو وێناکردنو بیرکردنەوەو تێگەشتنە ڕاستبێت، کە "ئەویتر" هەیەتی بۆ حەقیقەت، ئەگەر کەسی سێهەم، پێوەرێک بێت بۆ مەزەنەکردنو ڕاستیو ناڕاستی حەقیقەت، لەنێوان منو ئەویتردا، ئەوا پرسیاری سەرەکی ئەوەیە، کەسی سێهەم خۆی چ پێوەرێکی هەیە بۆ دیاریکردنی ڕاستیو ناڕاستی حەقیقەت؟ ئەو هێزو کێشانەکامەیە حەقیقەتی پێدەپێورێتو مەزەنەی دەکات لەدەرەوەی "من"و "ئەویتر"دا؟ درێژبوونەوەی ئەم پرسیارە، بۆ بەشداربوونی کەسی چوارەمو پێنجەم بۆ هەڵسەنگاندنیحەقیقەت، دەمانخاتە بەردەم ئەو ڕاستیەی، کە دەشێ هەموو کەس بەشداربێت لەپێوانەکاریو مەزەنەکردنی حەقیقەتدا، بەمپێیە، هەموو چەمکەکانی فرەییو لێبوردنو یەکتر قەبوڵکردنو دیموکراسیبوونو پێکەوە ژیان...هتد، بەندن لەسەر بیرۆکەی دابەشکردنی حەقیقەت بەسەر ئینسانەکاندا. کەواتە حەقیقەت لای هیچ کەسو لایەنو گروپێک نیە.

حەقیقەت جگە لەنهێنی بیرکردنەوەکانی مرۆڤو قەناعەتەکانی بەرامبەر بەژیان، هیچیتر نیە. جگە لەو وەهمە تاڵەی مرۆڤ، کە زۆرجار بێمانا لەسەری دەجەنگێو شەڕە خوێناویەکان بەرپادەکاتو سنوری شەڕانگێزیەکانی خۆی بەرفراونتردەکات، دەرئەنجامێکی دیکە ناخاتەوە، بەتایبەت لەو چرکەساتەدا کە تاکە کەسێک، پێیوایە جگە لەخۆی کەسیتر حەقیقەتی پێنیە، تەنها خۆی پاڵەوانی تاقیکردنەوەی ڕێگاکانی حەقیقەتە، وەک شەڕانگێزەکانو دیکتاتۆرەکان. دیکتاتۆرە گەورەکانو دیکتاتۆرە بچوکەکان، سیاسیە ناشارەزاکانو واعیزەکانیحەقیقەت، ئەوانەی جگە لەڕێگایەکو وەهمێکی تاریک،





شوێنی دیکەو مرۆڤی دیکەو نیشتمانی دیکە نابینن.

لەڕاستیدا ئەم بابەتە زۆر هەڵدەگریو فرە ڕەهەندە، لێرەدا ناکرێت لەپەیوەندیە قوڵەکانی بکۆڵینەوە، تەنها هەوڵمداوە کەم تا زۆر چەند سەرنجێک لەمەڕ ئەو چەمکە بخەمە ڕوو لای "هێرمان هیسە"، بەتایبەت لەم ڕۆمانەدا، کە یەکێکە لەشاکارە مەزنەکانی هیسەو حیکایەتی دوورو درێژی گەڕیدەکانە بەدوای حەقیقەتو نەمریدا، وەک هاوارێکی تراژیدیو دەنگێک لەقووڵایی ڕۆحی مرۆڤدا.

چەمکی حەقیقەت هەر لەبنەڕەتەوە پەیوەندیەکی قوڵو ناوەکی هەیە لەگەڵ چەمکی "یەقین"داو لە زۆر ڕێگای جیاوازەوە یەکدەگرنەوەو دواجار لەبەردەم عەقڵێکی زیندو،و گومانکاردا جەنگەکانیان دەردەکەون، بەتایبەت لەوکاتەدا کەحەقیقەت دەبێتە وەهمی دوا یەقینو لە ئاستە ڕۆحیو فەردانیەکەیەوە دەپەڕێتەوە بۆ ناو کایە سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئەخلاقیەکانو وەک کۆ، یەقینێکی دەستەیی دەخوازێت تا جیاوازیەکانی چواردەوری خۆی نەهێڵێت. بەمانایەکیتر لەوکاتەدا مەترسیدارە کە وەک ئەزموونێکی ڕۆحیو کردەیەکی ناوەکی ئەو پشکنینە دەرونیە جێدەهێڵێتو ئەو نیشتمانە قوڵەی ناخ چۆڵدەکاتو دواجار لەشێوەی عەقڵێکی دۆگماو بەرگریکاردا، دەپەڕێتە ناو ڕەنگەکانی دیکەی ژیانەوەو دەخوازێت دەستکارییان بکاتو جیهان ڕەنگ بکات بەو ڕەنگەی کە خۆی هەیەتی.

گەشتی دۆزینەوەی حەقیقەتو گەڕان بەدوای نەمریدا لەم ڕومانەدا، ئەو سەفەرە درێژو ترسناکو پڕ ئازارەیە کە هەموو ڕێگاکان بە سیدهارتای پاڵەوان تاقیدەکاتەوەو جیهانێکی سەیرو

میحنەتباری پێدەناسێنێت. جیهانێک کە بە ئەندازەی چێژو خۆشیەکانی، تراژیدیەو بەئازارو گریانو گوناه گەمارۆدراوە، بەئەندازەی ساتەخۆشو بەهەشتیەکانیشی غەمگینو دۆزەخیە.

ئەم ڕۆمانە یەکێکە لەو ڕۆمانە گرنگانەی بەوردی مرۆڤ لەبەردەم پرسیارە وجودیو ڕۆحیو چارەنوسسازەکانی خۆیدا ڕادەگرێتو پەشیمانی دەکاتەوە لەکورتە گەشتو حوکمە یەقینیە سەرەتاییەکانی خۆی، مرۆڤ لەوە ئاگاداردەکاتەوە، کە بوونەوەرێکە هەڵگری نیگەرانیو میحنەتو سەرگەردانیەکی گەورەیەو کۆیلەی ئەو کورتە گەشتو بێئیرادەییەی خۆیەتی، کە جگە لە کرانەوەو سەبرو نەفەس درێژی لەبەردەم تاقیکردنەوەی ڕێگاکانی حەقیقەتو نەمریدا، هیچ شتێکی دیکە ڕزگاری ناکات لەمەینەتو ئازاری ژیان، ئەم ڕۆمانە زیاتر دەخوازێت برینی ئەو زامە ڕۆحییو ئەزەلیە سارێژبکات، کەمرۆڤی کردوەتە بوونەوەرێکی بودەڵەو ترسنۆکو دەستەوەستان. برینێک، کە هەر لەسەرەتای یەکەمین چرکەساتی ئاگاییو بیرکردنەوەی مرۆڤ دەربارەی خۆی هەستی پێدەکرێتو سەرهەڵدەداتو ڕۆژ بەڕۆژ تەشەنە دەکاتو ئازارەکەی زیاتردەبێت.

یەکەمین ئاگاییو بەخۆداهاتنەوە لەم ڕۆمانەدا، لەو چرکەساتەوە دەستپێدەکات کەسیدهارتای پاڵەوان، دەکەوێتە بیرکردنەوەو بۆ یەکەمجار ماڵی باوکی جێدەهێڵێتو ماڵئاوایی لەئیرادەو دەسەڵاتی باوک دەکاتو ئیدی دەکەوێتە بەردەم قەدەرەکانەوە، لەکاتێکدا دنیای دەرەوەی ماڵ، دنیایەکە پڕە لەمیحنەتو ئازار، دنیایەکە ئیرادەو عومرێکی درێژ دەخوازێت تاوەکو گەڕیدەیەکی ڕێگای حەقیقەت بگاتە ئامانج. بەمانایەکیتر، بەجێهێشتنی ماڵو سەفەرو تاقیکردنەوەی





شوێنەکانو بینینی وێنەو دەموچاوە غەریبەکانی دیکەی ژیان، وەک غەریبەیەک، بەمەبەستی گەڕانو بەدوای ئاسودەییدا، بۆ یەکەمجار لەدەستدانی ماڵو دڵنیایی دنیای منالّیە، دارمانی بەهەشتێکی گچکەیە لەسێبەری فریادڕەسی باوکو ماڵدا، وشیاریو پرسیاری گەورەبوونیش یەکەمین هۆکاری ئەو دارمانەن، چ جای ئەوەی پرسیارە وجودیو برینە ڕۆحیەکان، مرۆڤ دەرکەن لەماڵ، یان تەماحەکانی دۆزینەوەی حەقیقەت سەری پێهەڵگرنو فڕێیبدەنە دنیایەکەوە کە مەحاڵبێت جارێکیتر ڕێگاکانی ماڵ بدۆزێتەوە. وەک چۆن سەفەری سیدهارتا سەفەرێکی هەتاهەتاییەو بۆ ئەبەد ناگەڕێتەوەو گەشتی دۆزینەوەی حەقیقەت، ڕۆژ بەڕۆژ نامۆتری دەکاتو دورتری دەخاتەوە تاوەکو تێکەڵ دەبێتەوە بەسروشتو بۆ هەتاهەتایە دەچێتەوە ناو وەحدانیەتی بوونو سروشتەوە، لێرەوە سیدهارتا دەخوازێت نەمری بەدەستبهێنێت، یان دەتوانین بڵێین لەم ڕۆمانەدا حەقیقەت واتە گەشتن بەنەمری، بەڵام ئەم گەشتەی سیدهارتاو بەجێهێشتنی منالّی، جۆرێک لەدەستدانی دڵنیاییە، واتە دۆڕاندنی دڵنیاییەک لەچوارچێوەی ماڵو منالّیدا لەپێناوی دۆزینەوەی جۆرێکی دیکەی دڵنیایی لەئاستی ئاگاییدا وەک بوونەوەرێکی کەینونەیی کە نزیکتری بکاتەوە لەنەمری، بەمانایەکیتر فڕێدان بێت بۆ بەردەم ڕێگاکانو گومانەکان، یان ئامادەکردنی مرۆڤ بێت، بۆ تاقیکردنەوەی خەیاڵو ئارەزوەکانو ئەزمونکردنی شێوازو ڕیتمەکانی دیکەی ژیان.

بۆیە هەر لەسەرتاوە، نوسەر دەمانخاتە بەردەم چارەنوسی نەزانراوی دوو کەسایەتی سەرەکی ڕۆمانەکە سیدهارتاو گۆڤیندا ئەو

دوو دۆستەی کەپێکەوە دنیای منداڵی بەرێدەکەنو موسیبەتی گەورەبوونو سەرەتای بیرکردنەوە، پێکەوە دەیانکاتە دەرەوەی دڵنیایی ساویلکانەی ماڵو دواجار جیاشیان دەکاتەوە لەیەکتر، بەڵام سیدهارتا ئەو پیاوەی کەهیچ هێزێک رایناگرێت لەگەڕانو پرسیارکردنو بیکردنەوە، لەو سەفەرە یەکجاریەدا، شێوازی جیاجیای ژیان تاقیدەکاتەوە. خەڵوەتکێشانو بیرکردنەوە لەجەنگەڵداو ژیان لەگەڵ زاهیدەکاندا، خەوتن لەگەڵ ئافرەتو مانەوە لەکۆڕی قوماربازەکاندا، مەی نۆشینو خەیاڵی پارەو پولو دەوڵەمەند بوونو لەبیرچونەوەی خۆیو مێژووی خۆی، فەرامۆشکردنی پرسیارە رۆحیو وجودیەکانی، هاورێیەتی لەگەڵ بازرگانو خاوەن سامانو شەهوەتبازەکاندا، بەڵام ئەمانە هیچیان ناتوانن بەیەکجاری مەبەستی سەرەکیو نهێنی ئەو گەشتەی لەبیربەرنەوە، دوای ئەوەی ماوەیەکی دوورودرێژ بەوجۆرە دەژیو لەگەڵ (کەماڵە)ی دۆستیدا، سەرگەرمی عەشقبازیو رابواردن دەبێت، رۆژێک لەباخچەکەی خۆیدا بەئاگادێتەوە، بیری دەکەوێتەوە کەبەدوای چیدا دەگەڕاو دەیویست بگات بەچی. کەدەکرێ ئەمە بە "بەئاگاهاتنەوەی دووەم" ناوبەرین لەم رۆمانەدا، جۆرێک، بەئاگاهاتەوە کە بەیەکجاری ماڵو سەروەتو (کەماڵە)و باخچەکەیو ئەو دنیایەی کە پاش ژیانی جەنگەڵ لەشاردا دروستیکردبوو بۆ خۆی، هەمووی بەجێدەهێڵێتو روودەکاتەوە ژیانی جەنگەڵ. هەرچەندە لەم گەشتەی ژیانیدا، هەرزوو گۆڤیندای هاورێی لەگەشتەکەی خۆی دەوەستێتو دەکەوێتە شوێن رێنماییەکانی"بودا"و دەبێتە یەکێک لەموریدەکانی، چونکە ئەو پێیوایە هەموو حەقیقەت لای بودایە، چیتر نایەوێ بگەرێتو پرسیاربکات، بەڵام کاتێک ئەم دوو





دۆستە دەگەنە لای بوداو پاش گوێگرتن لەپەندو ئامۆژگاریەکانی، گۆڤیندا شوێنی دەکەوێتو دەبێتە یەکێک لە تەوبەکارانی، بەڵام بودا سەرسام دەبێت بەوەی کە سیدهارتا باوەڕی پێناهێنێتو شوێنی ناکەوێت، سیدهارتا لەوە ئاگاداری دەکاتەوە، کە ئەوەی بوودا پێیگەشتوە، جۆرێکە لەحەقیقەتو دنیابینی بودا خۆی.. سیدهارتا دەیەوێت پێی بڵێ تۆ پیاوێکی مەزنیو گەشتی بەوشتەی کە خۆت خوازیاری بووی، منیش بەجۆرێکیتر بەدوایدا دەگەڕێم، بەڵام منیش دەمەوێ پێیبگەم، نەک شوێن کەوتووی کەسێکیتر بم. بەهەرحاڵ لەدارستان، جارێکیتر بەتەنها دەچێتەوە دنیای بیرکردنەوەو تێڕامانەوە. ماوەیەکی دوورو درێژ دوور لەدۆستەکەی سەردەمی منداڵی، ژیان بەسەردەبات. سیدهارتا لەوگەشتەدا بەتەنها ماڵی باوکی نادۆزێتەوە، بەڵکو لەو سەردانەیاندا بۆ بینینی بوودا، ئەو هاورێو دۆستەش دەدۆزێتەوە کە تاکە هاورێی سەردەمی منداڵیو گەورە بوونیەتی، هەمیشە لە سێبەرێک دەچوو بەدوایەوە. دوای ئەوە کەماڵەو هاورێ بازرگانەکەشی دەدۆزێتەوە، تەنیا دەکەوێت، ماوەیەکی دوورو درێژ لای بەلەمەوانێکی مەزنو تێگەیشتوو لەسەر رووبار دەمێنێتەوە. لەگەڵ ئەو پیاوە حەکیمەدا کە فێربوو بەتەنیا لەقەراغی رووباردا بژیو گوێ لەئاوازی رووبارو سروشت بگرێ، ساڵانێکی دوورو درێژ، لای ئەو بەلەمەوانە فێری هونەری گوێگرتن دەبێ، گوێگرتن لەرووبارو سروشتو دەنگە جیاوازەکانی ژیان. رووبار لێوان لێو بوو لە رووداوەکانو دەنگەکانی ژیانی مرۆڤ، فێربوو گوێ لەهەموو ئاوازەکان بگرێت، پاش ماوەیەکی زۆر، رۆژێک کەماڵەی سۆزانیلەگەڵ منداڵێکدا، لەو رووبارەوە تێدەپەرێ، سیدهارتا

دەناسێتەوەو پێیدەڵێت ئەمە منالّی تۆیە... منالێک کە سیدهارتا چاوەڕێی نەدەکرد.

چیتر لەو چرکەساتەوە، سیدهارتا دەکەوێتە داوی عەشقی منالّەکەی، بەلاّم منالّەکەی، سیدهارتا بەجێدەهێلێت و دەگەڕێتەوە بۆ شار. سیدهارتا دووبارە دەکەوێتە بەردەم دوو ئاڕاستەی جیاوازو پێچەوانە. ڕۆژێ لەناو ڕووباردا بیری دەکەوێتەوە کە باوکی پێیوتبوو گەر هاتیتەوە ئەنجامی سەفەرەکەت بزانم چۆن دەبێت، ئایا پاش عومرێکی درێژوو پیربوون، بیرکەوتنەوەی ماڵو گەڕانەوە بۆ ماڵ، خەونێکی‌منالانەیە، یان گەڕانە بەدوای چارەنوسی منداڵەکەیداو دۆزینەوەی، هەوڵدانێکی بێهودەیە. سیدهارتا خەریک بوو فێردەبوو گوێ لەڕووبار بگرێت، لەوکاتەدا کە دەیویست بە بەلەمەکەیەوە بەناو ڕوباردا بڕواتو سۆراخی منالّەکەی بکات، ڕوبار بەجۆشو خرۆشێکەوە کەوتە قسەکردن، چیتر فێری گوێگرتن بوو لەڕووبارو سرشتو تەنیایی، لەو نهێنیە تێگەیشت کە بەدرێژایی ژیانی عەودالّی‌بوو. ئەمەش بەئاگاهاتنەوەی سێهەمە، بەئاگاهاتنەوەیەکی‌یەکجاری، هیچ سرودێکو ئاوازێک، هێندەی دەنگی ڕووبار ئاسودەی نەدەکرد. سیدهارتا گەشتە پلەی کەماڵ، بەلەمەوانی پیر، سەوڵەکانی پێشکەش کردو خۆی گەڕایەوە دارستانو جیهانی وەحدانیەت.

لێرەوە، ئەم ڕۆمانە پێماندەڵێت دۆزینەوەی سەوڵی ئەو بەلەمەی کە بەناو ژیاندا گوزەردەکات، گەشتێکی دوورو درێژی دەوێت. دەبێت سەدان سەرکێشی‌و ڕسکو چاکەو گوناه تاقیبکەیتەوە. ئاسان نیە بەناو ڕووداوەکاندا تێپەڕی، لەڕووبارەوە تێپەڕی‌و ڕووداوەکانی ناو





ڕووبارو ژیانو خەڵکی ببینیت، تەنها ئەو کەسە بە سەوڵو بەلەمەوە بەناو ڕووباردا دەڕوات، کەخۆی لەناو تەوژمی شەپۆلەکانو ڕووداوەکانی ڕووباردا ون نابێتو بەردەوامە. ئەو پیاوە کۆچەری‌و گەڕیدەو بیرکەرەوەیە، کە زەینی ڕۆشنەو شتەکان وەک خۆیان دەبینێت. هێسە، پێمان دەڵێت، گەڕان بەدوای حەقیقەتدا هەروا ئاسان نیە، کۆمەڵە شتێکی زۆر گرنگت پێدەدۆڕێنێ، تراژیدیاو ئازارو کارەساتی خۆی هەیە، تا دەگەیتە پلەی کەماڵو ئاڕاستەو ڕێگاکانی حەقیقەت بدۆزیتەوە، ئەوەی کەدێتە چارەنوس‌و ئایندەی سیدهارتاوە، بوونی منالێکی کوتوپڕە، عەشقێکی شێتانەو بێمەبەستی سیدهارتایە بۆ منالّەکەی. ئەوەی گرنگ بێت تێبگەین لەم ڕۆمانەدا، ژیانە لەهەنوکەدا بەبێ مێژوویەک پڕ لەئازارو بەبێ بوونی وەهمی ئایندەیەک. گەڕانو خۆشەویستی بۆ منالّەکەی، دەبێتە نیگەرانیەکی گەورەو هەم دەبێتە چارەنوسی سیدهارتا. لەکاتێکدا سیدهارتا تەمەنی زۆری کردوەو پیربووە، بەلاّم ئەو مێژوەی لەیادنەماوە، کاتێک ماڵئاوایی لەباوکی‌و ماڵە خنجیلانەکەی دەکاتو بەڵێندەدات بەباوکی کە بگەڕێتەوە بۆ لای، بەلاّم ڕێگاو ئاڕاستەی جیا جیا، مرۆڤی جیا جیاو پرسیاری جیا جیای ژیان بەیەکجار ئەو مێژووە لەیادەوەریدا وندەکات، تا ئەوکاتەی سەوڵی بەلەمەکە دەگرێتە دەستی‌و دەیەوێت منالّە هەڵهاتوە ونبوەکەی بدۆزێتەوە، منالێک کەهەرگیز چاوەڕێی نەدەکرد، ئەو تەنها چێژی خەوتنی شەوانەی لەگەڵ کەمالەدا بۆ ماوەیەک لا مەبەست بوو، بەلاّم چاوەڕێی ئەو قەدەرە غەمگینەی نەدەکرد کەڕۆژێک لەڕۆژان، بەوشێوەیە کەمالە لەڕووبارەوە گوزەربکاتو مندالێک پێشکەشی سیدهارتا بکاتو خۆشی لەکەناری

ڕووباردا مار بیگەزێو بمرێو دواهەمین زەردەخەنەو گریانی بەرێتە بەردەم سیدهارتاو دواهەمین نیگاشی سەیرکردنێکی قوڵی چاوەکانی سیدهارتا بێت، چ قەدەرێکی بەدە، چ ڕێگایەکی ترسناکە گەڕان لەدووی ئارامی ڕۆحو نەمریدا... سیدهارتا لەناو ڕووباردا بیری کەوتەوە کە دەشێ بگەڕێتەوە بۆ ماڵ... ئەمە دوای چەندین ساڵو چەندین شەونخونی جوانیو پیریو زۆربوونیچرچو لۆچێکی غەمبار لەڕوخسارە نورانیەکەیدا ، چ بڕیارێکی قورسو دوودڵیەکی کوشندەیە، گەڕانەوە بۆ ماڵ، یان دۆزینەوەی منداڵەکەی، بەرەو چارەنوس  یان گەڕانەوە بۆ مێژوو،و یادەوەریەکان، سیدهارتا بەناو شەپۆلەکانی ڕووباردا بەسەوڵەکانەوە تێدەپەڕێت، خەیاڵێک بەرەو ئایندەو چارەنوس دەیبات، خەیاڵێکیش دەیباتەوە بۆ ماڵ، بەرەو نیشتمانی منداڵی، بەڵام بۆ دواجار دەنگی فێنکی ئاوو نەسیمی شەپۆلەکان بۆ هەتاهەتایە رایدەگرن لەناو دڵی سروشتدا، بۆ هەمیشە بەئاگا دێتەوەو لەهەنوکەیەکی بەردەوامدا برینەکانی ڕۆحی دوور لەئازاری ڕابوردوو،و موسیبەتی داهاتوو بۆ ئەبەد سارێژدەبن. چیتر لەوساتەوە بەڕاستی دەنگی ڕووبار دەبیستێ، بەدەم ئاوازەکانی سروشتو شەپۆلە بەردەوامەکانەوە ڕادەمێنێ، ئیستێک دەکات، وەستانێک، کە یەکەمینو دواهەمین ئارامیو ئاسودەیی ڕۆحی سیدهارتایە. چیتر فێری ئەوەبوو چۆن گوێ لەڕووبارو سروشت بگرێتو لەنهێنی ژیان تێبگات. هێدی هێدی بەدەم ئاوازو دەنگی شەپۆلەکانەوە تێکەڵ دەبوو بەنەغمەی سروشتو چێژی هەمیشەیی ڕۆح، بۆ دواجار لانەی منداڵیو ڕوخساری باوکی لەیادەوەریدا سڕایەوەو ئاگری ئەو عەشقەش دامرکایەوە، کە بۆ منداڵەکەی کڵپەی





سەندبوو... توانی بۆ هەتاهەتایە هاوڕێی ڕووبارو سروشت بێت. هەمیشە لەهەنوکەدا بێتو هەمیشە هەست بەئاسودەگی بکاتو ببێتەوە بە بەشێک لەسروشتو بچێتەوە قۆزاخەی یەکێتی شتەکانەوە، دواجار ببێتەوە بەدرەختێک لەدارستانو پاش گەشتی نەمری چیتر سەوڵەکانی بۆ گۆڤیندای هاوڕێو دۆستی منداڵیو گۆڤینداش دوای خۆی بۆ هەرکەسێکی دیکەی ڕێگای حەقیقەت بەجێبهێڵێت. ئەمەش بەردەوامی ژیانو زیندویەتی ڕۆحی مرۆڤە بۆ هەمیشە. ئەوەی نەتوانێت ڕێگاکان تاقیبکاتەوە، برینە ڕۆحیەکانی سارێژکاتو بەسەوڵەوە بەناو ڕووبارو ژیاندا تێپەڕێت، ئەو کەسەی گێرۆدەی پرسیارەکان دەبێتو دەستەوەستان دەمێنێتەوەو گێرۆدەی خەیاڵەکانیئەویتر دەبێتو بەنرخی حەقیقەت دوای وەهمەکانی دەکەوێتو بیرناکاتەوە، هەمیشە مەخلوقێکی غەمگینو نیگەرانو بێهودەو مایەپووچە.

***وەرگێڕی کوردی***

❋❋❋

**ئەو وشەو زاراوانەی لەرۆمانەکەدا بەکارهاتوونو پەیوەندیان بەکلتوری هندیەکانەوە هەیەو وەرگێڕی فارسیەکە، روونی کردوونەتەوە، بەپێویستم زانی وەریانبگێڕم:**

Om **"ئوم"** وشەیەکی پیرۆزەو سەرەتاو کۆتایی دوعاو نزای براهماکان پێکدەهێنێت، هەروەها بەواتای "وجود اعلی" یاخود "ڕەحمەتی موتڵەق" یا "زات اکمل" یاخود "خودا" دێت.

Atman **"ئاتمان"** بەواتای ڕۆحو گیان دێت، لەمەزهەبی هیندیەکاندا ئەوەیە کە لەگەڵ مرۆڤدا هەمیشەییو ئەبەدیەو نەمرە، بەپێچەوانەی ئەوەی کە لەمرۆڤدا دەمرێتو لەناودەچێت.

Rig-veda **"ڕیگ ڤیدا"** بەشێکە لە کتێبی پیرۆزی هیندیەکان. "ڤیداها" کە لەچەند بەشێک پێکهاتووە، ڕیگ ڤیدا یەکێکە لەوبەشانە.

Prajapati **"پراجاپاتی"** لەمەزهەبیهیندیەکاندا بەواتای درووستکەری جیهانو گەردوون دێت، واتە خوداوەندی خالق.

Upanishads **"ئوپانیشاد"** یەکێکیترە لەکتێبی پیرۆزی هیندیەکان کە لەچەند بەشێک پێکهاتووە.

Sama-veda **"ساماڤیدا"** بەشێکیترە لەکتێبی پیرۆزی "ڤیداها".

Chandgya-upanishad **"چاندۆگیا-ئوپانیشاد"** بەشێکە لەکتێبی پیرۆزی "ئوپانیشاد".

Brahman **"براهما"** بەواتای **"بەرجەستەکەری ڕۆحی عالەم"** دێتو لەمەزهەبی براهماییزمدا مەزنترین خوداوەندە.

Satyan **"ساتیان"** ئەم وشەیە بەواتای حەقیقەت دێت.

Banyana **"بانیانا"** ناوی درەختێکە کە زۆر زیاد گەورە دەبێتو





سێبەرێکی بەرفراوان لەسەر زەوی دەخات.

Samana **"سامانا"** خەڵوەتکێشەکان دابەشدەبن بەسەر چەند تاقمێکی جیاوازدا، یەکێک لەو گرووپانە کە زیاتر لەهەموویان لەهونەری بیرکردنەوەو ئەزموونکردنو تێگەیشتن لەحەقیقەت بەهرەمەندترە لەو ڕێگایەدا، ئەوە پێی دەوترێت سامانا.

Nirvana **"نیرڤانا"** ئەم وشەیە بەواتای "ئازادی" دێت، ئازادی لەوهەمەکان، ئازادی لەپەیوەندیە دنیاییەکان، نیرڤانا دواهەمین پلەی کەماڵی ئینسانیە کە بەپێیبیرو باوەڕی بودیەکان، مرۆڤ دەتوانێت لەوێوە بگاتە دوا ئامانجی خۆی.

Gotama **"گۆتاما"** ناوی بنەماڵەی بودایە، سیدهارتا ناوی یەکەمی بودایە، ناوی دووهەمیشی گۆتامایە.

Buddha **"بودا"** واتە حەکیمو زانا، هەرکەسێک کە گەشتبێت بەزانستی باڵاو دواپلەی حیکمەتو دواپلەی کەماڵو پلەی خودایی بەدەستهێنا، دەبێتەبودا.

Sakya **"ساکیا"** ناوی بنەماڵەو نەژادی بودایە، ئەو بنەماڵە میرنشینە لەسنورەکانی باکوریماگادها فەرمانڕەواییان کردووە.

Yoga-veda **"یۆگا ڤیدا"** بەشێکیترە لەکتێبی پیرۆزی هیندیەکان.

Atharva-veda **"ئاتهارڤا ڤیدا"** بەشێکە لەکتێبی پیرۆزی ڤیداها.

Mara **"مارا"** ناوی خوداوەندی شەهوەتو گوناهە، ئەوەی کە مرۆڤ دەخاتە کەڵکەڵەو دڵەڕاوکێوەو دواجار ناشیرینی دەکات.

Maya **"مایا"** بەواتای وەهم دێت، هەروەها ناوی دایکی بودایە.

Bo **"بۆ"** جۆرە درەختێکی هەنجیرە لەجەنگەڵەکاندا، بودا لەژێر ئەو جۆرە درەختەدا بەتەواوی فکری ڕۆشن بووەو گەشتە نیرڤانا.

Vishnu "**ڤیشنۆ**" ناوی خودای هیندیەکانەو یەکێکە لەسێ خوداوەندە مەزنەکە، کە نازناوی "چاودێر"ی هەیەو پاراستنی جیهان لەئەستۆی ئەودایەو سات دوای سات دەگەڕێتەوە جیهان تاکو مرۆڤ ڕزگار بکات.

Laxmi "**لاکشمی**" لەمەزهەبی هیندیەکاندا خوداوەندی سەروەت و سامانەو یەکێکە لە مەعشوقەکانی "ڤیشنۆ".

Sansara "**سانسارا**" واتە دەریای لەدایکبوونو مردن لەمەزهەبی هیندیەکاندا، بەواتای لەدایکبوونە یەک لەدوای یەکەکان دێت، واتە دۆنادۆن کە تەناسوخێکی ئەبەدیە.

Krishnan "**کریشنا**" بۆ جاری هەشتەم کە ڤیشنۆ لەبەرگی مرۆڤدا دێتەوە بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤایەتی لەشێوەی کریشنادا دەردەکەوێت، لەکتێبی پیرۆزی هیندیەکاندا، کریشنا "بهاگڤاد گیتا "-bhagvad guita یاخود "سرودی خوداکان"ە.

Agni "**ئاگنی**" خوداوەندی ئاگرو ڕۆشناییەو یەکێکە لەخوداوەندە مەزنەکانی ڕۆژگاریڤیداکان.

***

# کوڕی براهما

سیدهارتا... جوانێکی براهمازادە، لەگەڵ گۆڤیندای هاوڕێیدا، ئەو دۆستە هاوتەمەنەیکە لەهەموو شوێنەکاندا، لە سێبەری دیواری ماڵەکاندا، لەبەر خۆرەتاوی کەنار روبارو لێواری بەلەمەکاندا، لەژێر سێبەری درەختە ڕەنگ پەڕپوەکانی دارستانو لەژێر دارهەنجیرەکاندا هێندە هۆگری یەکتر بووبوون، نەیاندەتوانی قەدەرێک لێکدی جیاببنەوە، هەمیشە پێکەوەڕۆژەکانی منداڵییان دەگوزەراند، ئەوساتانەی لەکەناریڕوبارەکاندا دەستنوێژی دەگرتو بە مەبەستی پاکبوونەوە خۆی دەشۆری بۆ مەراسیمی پیرۆزی قوربانیەکان. خۆری نیوەڕوان ناوشانی سوتاندبوو، هەمیشە لەوساتانەدا کە دەنگی دایکی دەبیستو لەژێر درەختەکانی"ئەنبە"دا یاری دەکرد، یان کاتێک گوێڕایەڵی ئامۆژگاریەکانی باوکی دەبوو کە لەگەڵ پیاوە هۆشمەندو حەکیمەکاندا دادەنیشت، سێبەری هەورێکی ڕەش دەنیشتە سەر چاوەکانی، ڕۆژگارێکی درێژ بەوجۆرە بەشداریدەکرد لەسەر گوزشتەو بیرەوەری حەکیمەکانداو گفتوگۆی دەکرد لەگەڵ گۆڤیندای هاوڕێیدا. هەردووکیان هاوبیرو تەبابوون لە چۆنیەتی هونەری بەهێزبوونو مەشقی بیرکردنەوەو ئەزموونکردنی ئەندێشەکاندا، ئەمەش فێریکردبوو کە چۆن وشەی"ئۆم" یان ڕۆحی وشەکان لە دڵەوە بڵێتەوە، فێرببوو چۆن لەناخی دڵیەوە ئەو وشەیە لەگەڵ جوڵەی هەناسەکانیدا ڕێکبخات، دیاربوو هەر لەوچرکە ساتانەوە ڕۆحێکی پاک لەڕوخسارەڕۆشنو میهرەبانەکەیدا ئەدرەوشایەوە، دەیزانی چۆن





نەمری "ئاتمان" لەقوڵایی ویژدانییدا بەرجەستەبکات.

هەمیشە شەوقێک دڵی باوکی ڕادەچڵەکاند، چونکە دەیبینی سیدهارتا ئەو هەموو هۆشو زیرەکیو تاسەو ئارەزوەی هەیە کە دەیخاتەگەڕ بۆ فێربوونی حیکمەت، هەمان ئەو شەوقەشی دەبینی کە ڕۆژێک دێت کوڕەکەی دەبێتە پیاوێکیحەکیم یان دەبێتە کاهینێکی باڵاو پلەبەرزو شازادەیەک لەناو براهماکانی تردا.

دڵی دایکیشی شادمان دەبوو کاتێک هەڵسوکەوتو ڕەفتاری کوڕەکەی دەبینی کە لەوپەڕی بەهێزیو جوانیدایە، سەرباری ئەو خزمەتکردنە بەردەوامو ڕێکوپێکەی دایکی لەپێناوی کوڕەکەیدا، هەربۆیە بەو هەموو چاکەو دڵسۆزیو میهرەبانیەوە دوعاو نزای بۆ دەکردو خوازیاربوو سەلامەتو سەرفرازبێت.

کاتێک لەکۆڵانەکانی شاردا بەقەدو باڵایەکی ڕێکو بەرزو باریکەوە، بەنیگایەکی شاهانەوە بەڕێگادا دەڕۆیشتو بەفیزێکەوەو لەخۆڕازی بونێکی مەزنەوە سەری هەڵدەبڕی، بەداوە عاشقانەکەی دڵی کچانی لەخشتە دەبرد.

گۆڤیندای دۆستو براهمازادەی، سیدهارتای لەهەموو کەسێک زیاتر خۆشدەویست. گۆڤیندا شەیدای چاوەکانی سیدهارتاو دەنگە سافە پرشنگدارەکەیو ڕەفتارە میهرەبانەکانیو هەڵسوکەوتەکانیبوو. هەرشتێک کە سیدهارتا بیگوتبا، ئەو جێبەجێی دەکرد، زیاد لەهەموو کەسێکیتر خۆشیدەویستو هۆشو زیرەکیو بیرکردنەوە گەرمو سوتێنەرەکەی دەپەرستو شەیدای ئیرادەو بەهێزیو گەورەیی سیدهارتا بوو.

گۆڤیندا بەباشی دەیزانی سیدهارتا نابێتە براهمایەکی سادەو

کاربەدەستێکی جەستە پەرست لە مەراسیمی قوربانیەکاندا، نابێتە قسەکەرێکی بەجۆش‌و بێژەری قسەی پڕوپووچو جادووگەرانە، یاخود قسەکەرێکی لەخۆڕازی‌و بێ‌نرخ، نابێتە کاهینێکی توندڕەوو ئازاردەر، یان وەک مەڕێکی گێژو گەمژە لەناو ڕانێکی گەورەدا.

نەخێر.. گۆڤیندا خۆیشی نەیدەویست ببێت بەشتێک لەو جۆرە شتانە، یان ببێت بە براهمایەک وەک ئەو دەیان هەزار براهمایتر، بەڵکو خوازیاری ئەوەبوو دەیویست هەمیشە بەدوای سیدهارتای‌خوێن شیرین‌و شکۆمەندی دۆستیەوە بێت یان ئەگەر سیدهارتا ڕۆژێ لەڕۆژان عابای خودایی پۆشی‌و لەڕیزی نورانیەکاندا دەرکەوت، ئەوکاتە ئەویش دەتوانێت ئەو خواستو خولیایەی هەبێت کەدۆستو هاودەمو خزمەتکارێک بێت بۆ سیدهارتا، یان ببێتە دار نەیزەکێکو هەمیشە وەک سێبەرێک بەدوایەوە بێت.

بەم شێوەیە هەمووان سیدهارتایان خۆشدەویست، چونکە ڕوخسارو نیگاکانی هەموو کەسی شادمان‌و دڵخۆش دەکرد، بەڵام سیدهارتا خۆی دلخۆش نەبوو، هەمیشە بەژێر درەختی هەنجیرەکانداو بەناو باخچەکاندا دەگەڕا، بەناو ئەو ڕیگایانەدا کە پڕبوون لەگوڵو ڕێحانە، لەسێبەری شینباوی درەختی باخچەکاندا دادەنیشتو بیری دەکردەوە، هەموو ڕۆژێک بۆ مەراسیمی چاکەکاری‌و پابوونەوەی لەگوناهەکان، بازوەکانی خۆی دەشۆری. پێشکەشکردنی ئەو قوربانیانەی کە بەو هەموو خۆشەویستی‌و جوانیەوە لە قوڵایی‌و تاریکی دارستانەکاندا ئەنجامدەدران، مایەی پەیوەندی‌و سۆزو خۆشەویستی خەڵکی بوون، کەچی لەناخی ئەودا وزەو چالاکیەکی ئەوتۆی نەدەبزواند، بینینی ئەستێرە پرشنگدارەکان،





تیشکە ژیان بەخشەکانی خۆر، جوڵەو سەمای بەردەوامی ڕووبار، هەموویان بوون بەمایەی خەیاڵو بیرکردنەوە سەرگەردان‌و بێتروسکاییەکەی ئەو، تەماشاکردنی دووکەڵی قوربانیەکان یاخود بیستنی دێڕە ڕۆحپەروەرەکانی "ریگ ڤیدا" ئەوانەی لەڕێگای پەندو ئامۆژگاری براهما پیرەکانەوە دەبیستران‌و دەوترانەوە، مایەی بێ‌ئارامی‌و بیرکردنەوە بوون بۆسیدهارتا، لێرەوە هەستی بە "تۆوێک" دەکرد، تۆوێک بۆ نەهێشتنی ئەو ڕازیبوون‌و ملکەچیەی لەدڵیدا جێگیرببوو.

دەیبینی عەشقی باوکو دایکی‌و خۆشەویستی گۆڤیندا دڵخۆشی ناکەن‌و بۆنی خۆشبەختی پێنابەخشن‌و پیاڵەی ڕۆحی ئەو پڕناکەن، بەردەوام هەستی بەوە دەکرد کە باوکی مەزن‌و مامۆستا چاکەکارو میهرەبانەکانی، ئەوەی لەتورەکەکانیاندا بوو، هەمیشە بۆنی دیاری‌و بەخشینەوەی لێدەهاتو ئەوەش کە لەپەندو ئامۆژگاریەکاندا بە ئاسانی دەستیان دەکەوێت، لەپیاڵەی ڕۆحی ئەوا هەڵیانڕشتووە، ئەو ڕۆحی تامەزرۆو تینووی فێربوون بوو، بەڵام هێشتا ئەو پیاڵە پڕ هۆش‌و زیرەکیەی ئەو خۆشنوود نەبووبوو، ئارامیەک لەڕۆحو بێدەنگیەک لەدڵیدا جێ‌و ڕێی خۆشنەکردبوو، چۆنیەتی خۆشۆرین‌و دەستنوێژ گرتنی بە چاکەکاری دەزانی، بەڵام ئەم جۆرە کارانە جگە لە ئاو، سامانێکیتر شک نابەن، بۆیە نەیدەتوانی‌گوناهەکان بشواتەوەو ئاسودەیی بەدڵە غەمگینەکان ببەخشێت، پێشکەشکردنی قوربانیەکان‌و لێبوردەیی خوداکانی بەکارێکی پەسەندو دروست دەزانی، بەڵام ئایا ئەم کردەوانە هەموو شتێکیان لەخۆیاندا حەشارداوە؟ ئایا پێشکەشکردنی قوربانی دەبێتە مایەی خۆشبەختی؟ ئایا خوداکانیش

بەڕاستی ئەو "پراچاپاتی"یە بوون کە جیهانی دروستکرد؟ مەگەر ئەوە ئاتمان نەبوو کە گەردونی بە تەنها دروستکرد؟ ئەی مەگەر ئەو خوداوەندە جۆربەجۆرانەش خۆیان مەخلوقێک نەبوون بەشێوەی منو تۆو ئەوانیش نارۆنو لەناوناچن؟ ئایا بەم پێیە پێشکەشکردنی قوربانی بە خوداکان ڕاستو دروستو بەجێیە؟ ئەی ئەگەر ئەو قوربانیو شانازیانە پێشکەش نەکەین بەئاتمانی تاقانە، باشە ئەتوانین ئیتر پێشکەشیان بکەین بە کێ؟ بەڵام ئاتمان خۆی لەکوێیە؟ لەچ شوێنێک ژیان دەباتە سەر دڵە جاویدانیەکەی لەکوێ ترپەی دێ؟ مەگەر ئەو لەناو ڕۆحو ناخداو لەو ویژدانە پەنهانەدا لانەی نەکردووە کە هەموو تاکە کەسێک هەڵگریەتی؟ بەڵام ئەم ڕۆحە، ئەم ناخی دەرونە خۆی لە کوێدایە؟ ئایا ئەم گۆشتو ئێسقانو بیرو هەستانە هەمان ئەو شتانەن کە پیاوانی داناو حەکیم لەوانەکانیاندا دەیڵێنەوە؟ ئەگەر ئاتمان لێرە نەدەبا، ئەی ئەو کاتە لەکوێ دەدۆزرایەوە؟ ئایا بەراستی گەڕانو تەیکردنی ئەم ڕێگایەو گەڕان بەدوای "خود"دا بۆ خواستی بوون بە "ئاتمان" هیچ نرخو بەهایەکی دەبێت؟ هیچ کەسێک ئەم ڕێگایەی نەناسیوەو لەم بارەیەوە شتێکی نەزانیوە تەنانەت باوکیو مامۆستاکانیو حەکیمی سرودە پیرۆزەکانیش شتێکیان لەبارەوە نەزانیوە، کتێبە پیرۆزەکانی براهماکان شارەزاییان لەهەموو شتێکدا هەبووەو ئاگاداری هەموو شتێک بوونو لەهەموو شتێکیشیان زانیوە، دەربارەی درووستبوونی جیهانو ڕەگو ڕیشەی قسەکردنو دەربڕین دەربارەی خۆراکو دەم بردنو دەم هێنانەوە، دەربارەی ڕێکخستنی هەستەکانو کرداری خوداکانو کۆمەڵە شتێکی بێشومار بەئاگابوون، بەڵام ئایا زانینی ئەو هەموو شتانە بەبێ ئەو شتە گرنگو





بێهاوتایە بەهاو نرخێکی هەبووە؟ بڕێکی زۆر لەکتێبە پیرۆزەکانو لە هەمووشیان گرنگتر "ئوپانیشاد"و "ساماڤیدا" باسیان لەو شتە دەرونیو ناوەکیە کردووەو نوسیویانە "ڕۆح وەهەمو خەیاڵکرنێکی جیهانە" هەروەها دەڵێن "لەوکاتەدا کەمرۆڤ دەخەوێت، دەچێتەوە ناوخۆییو لە "ئاتمان"دا نیشتەجێ دەبێت".

لەو حیکمەتەی حەکیمەکانداو لە دێڕە پەنهانەکانیاندا، گەنجینەیەک لە عەقڵ بەزمانێکیسیحر ئامێز، وەک "هەنگوین"ێکی بێگەرد دەرکەوتووە، نەخێر ئەو هەموو حیکمەتو زانیاریەی براهما ژیرەکان نەوە لەدوای نەوە کۆیان کردوەتەوە، ناکرێت وا بەو سادەییو ئاسانیە فڕێبدرێو بخرێتە لاوە، بەڵام لەکوێن ئەو براهماو کاهینو حەکیمانەی کە بەدۆزینەوەو دەسکەوتنی ئەو حیکمەتە ئاسودەبوونو خۆشەویستیشیان هەیە بۆ بەکارهێنانی ئەو حیکمەتانە؟ لەکوێن ئەو کەسانەی کە لەدنیای خەودا توانیویانە بگەن بە "ئاتمان"و ئەو کورتە گەشتەی خەونو بە "ئاتمان"بوونەش لەهۆشیاریو ژیانو گوتارو کردارەکانیاندا ئەزموون بکەن، یاخود لەهەموو شوێنێکدا ئامادەگی هەبێت؟

سیدهارتا چەند براهمایەکی دەناسی، مەزنترو باڵاتربوون لەو براهمانەی کە باوکی دەیناسین، بەڵام باوکی پیاوێکی عاقڵو بەڕێزبوو، هەروەها چاکە کارو خاوەن ڕەفتارو کرداری نەجیبانە بوو، شکۆمەندانە ژیانی دەبردەسەر، قسەکانی سەنگینو بەهێزبوون، پڕبوون لە بیرۆکەی گەورەو مەزن، بەڵام ئایا ئەو پیاوەی کە ئەو هەموو شتەی دەزانیو ئەوەندە حەکیم بوو، دەیتوانی ژیان نزیک بکاتەوە لەبەختەوەری؟ ئایا خۆی لەخۆشیدا دەژیا؟ مەگەر ئەویش

گەڕۆکێکی بێئارام نەبوو؟ ئایا ئەو پیاوەی کە خاوەنی ئەو شەوقە فراوانە بوو، ئەی بۆ خۆشۆرینو دەستنوێژگرتن نەدەچووە سەر کانیە پیرۆزەکان؟ مەگەر قوربانی نەدەکرد؟ کتێبی پیرۆزی لەبەرنەدەکرد؟ بەشداری نەدەکرد لەکۆڕی براهماکاندا؟ ئەی باشە بۆ دەبوو هەموو ڕۆژێ گەردی گوناه لەخۆی بتەکێنێو سەرلەنوێ وابەستەییو پەیوەندیەکانی خۆی پاکو بێگەرد بکاتەوە؟ مەگەر "ئاتمان" لەڕۆحی ئەودا لانەی نەکردبوو؟ مەگەر ئەو کانیە لەناو دڵی ئەودا نەبوو؟ پیاو دەبێت ئەو ناوەندو سەرچاوەیە لەدەرونی خۆیدا بدۆزێتەوەو ببێتە خاوەنی، ئەگینا هەموو شتەکانیتر دەبنە گەڕانی بێهوودەو لادانو هەڵەداوان.

چەخماخەو بیرکردنەوەو غەمەکانی سیدهارتا هەموو لەم جۆرەبوون، سیدهارتا ئەو قسانەی دەهێنایەوە یادی خۆی کە کەسێک لە "چاندوگیا_ئوپانیشاد" گوتبووی "(لەڕاستیدا "براهما" ناوی "ساتیان"ەو هەر کەسێک ئەم نهێنیە بزانێت، هەر ڕۆژێک بێت دەچێتە جیهانی نورانیەکانەوە" ئەم جیهانە، بەهەشتیو ئاسمانیەو زۆر نزیک دێتە پێش چاو، بەڵام هیچ کاتێک سیدهارتا نەیتوانی بوو بەدەستی بهێنێتو ئەو تینوێتیە سوتێنەرە لەناو بەرێت.

لەناو ئەو پیاوە حەکیمانەدا، کەسیدهارتا چێژی لەوانەکانیان وەردەگرت، کەسێک نەبووگەشتبێت بەو جیهانە بەهەشتیە یاخود ئەو تینوێتیە جاویدانیەی دەرخستبێ، سیدهارتا دۆستەکەی خۆی بانگ کردوو وتی: (گۆڤیندا... وەرە تا بەژێر درەختەکانی "بانیان"دا بڕۆینو سەر بەرینە ناو سینەی بیرکردنەوەو تێڕامانەوە)، پاشان بەژێر درەختە "بانیان"ەکاندا تێپەڕینو بیست هەنگاو دوور لەیەکتر دانیشتن،





لەوکاتەدا خۆیان ئامادە دەکرد تاکو وشەی "ئۆم" بڵێنو بیخەنە سەر زمان، سیدهارتا بەهێمنی ئەم شیعرەی خوێندەوە:

**"ئۆم" کەوانە**
**ڕۆحیش دەبێتە تیری ئەو**
**براهمایش نیشانەی ئەو تیرەیە..**
**لەم کارەشدا ئیرادەیەک لەخۆتا شک نابەیت**

کاتێک دەمەو ئاوابوون ساتەکانی بیرکردنەوە دەستی پێکرد، دنیا تاریک بووبوو، کاتیئەوە هاتبوو دەستنوێژی شێوان بەجێبهێنن. گۆڤیندا هەستایە سەرپێ ناوی سیدهارتای هێناو بانگیکرد، بەڵام هیچ وەڵامێکی نەبیست. سیدهارتا لەجیهانی ئەندێشەو بیرکردنەوەدا نوقم بووبوو، چاوەکانی بەسەر خاڵە دوور دەستەکانەوە واق وڕمابوونو سەری زمانی لەنێوان ددانەکانیدا دەرکەوتبوو، بەجۆرێک دەهاتە پێشچاو وەک بڵێی هەناسە نادات، بەوجۆرە دانیشتبوو نوقمی دنیای بیرکردنەوە بوو، بیری لە "ئۆم" دەکردەوە، ڕۆحیشی لەو تیرە دەچوو کە براهمایکردبێت بەنیشانە.

دێرزەمانێک بوو چەند کەسێک لەشارەکەی ئەواندا ڕۆشتبوون، ئەوانیش سێ زاهیدی لاوازو پەرێشانو سەرگەردان بوون، جوانیو پیرییان نادیاربوو، بەشانی خوێناویو خۆڵاویەوە بەئەندازەیەک ڕووتبوون، لەژێر گەرمای خۆرەتاوا سوتابوون. هەرسێکیان گۆشەگیرو نائاشناو دوژمن خەسڵەت، لەدنیای ئادەمیەکاندا وەک چەقەڵی لاواز دەبینران، ئەو سێ زاهیدە وەک ئارەزوویەکی خامۆشو ڕۆحێکی ڕزیو،و نەفسکوژراو دەواری هەورێک دایپۆشیبوون. کاتێک شەو داهاتو پاش ئەوەی ساتەکانی تێڕامانو بیرکردنەوە

بەسەرچوون، سیدهارتا بە گۆڤیندای وت: (ئەی دۆستی من.. بەپشتیوانی خودا، بەیانی سیدهارتا دەڕواتو پەیوەندی دەکات بە "سامانا"کانەوە، دەڕوات بۆئەوەی خۆشی ببێت بە "سامانا"). بەبیستنی ئەم قسانەی سیدهارتا، ڕوخساری گۆڤیندا ڕەنگی پەڕیو لەسیمای دۆستەکەیدا ئیرادەو بڕیارێکی دامەزراو،و جێگیری بەدیکرد، وەک تیرێک کە لەتیروکەوانێک ترازابێت، چیتر گۆڤیندا لەو یەکەمین نیگایەوە کە نیشتە سەر روخساری سیدهارتای دۆستی، زانیچیتر حاڵەتی "سامانا"کان لە سیدهارتادا دەرکەوتووەو وابەستەیە پێیانەوە، بۆیەدەرکەوت سیدهارتا ڕێگەیەکی بۆخۆی هەڵبژاردووەو دەرکەوتنی چارەنوسیشی دەستپێکردووە، بەڵام بەدەرکەوتنی چارەنوسی سیدهارتا، چارەنوسی گۆڤیندا خۆشی، ئاراستەیەکیتر وەردەگرێت. لەوساتەدا وەک تویکڵی وشکی مۆزێک ڕەنگی پەڕیو دۆشداما، پاشان دەستیکرد بەهاوارکردنو وتی: ئەی سیدهارتا.. ئایا باوکت بوارو دەرفەتی ئەوەت پێدەدات ئەم کارەت جێبەجێبکەیت؟. سیدهارتا وەک کەسێک لەخەونێکی قوڵ ڕاچەنیبێت، سەیرێکی گۆڤیندای کردو بەنیگایەک بانگی لەڕۆحی کرد، پاشان لەڕوخساریدا پەشۆکانو شپرزەییو تەسلیم بوونی بەدیکردو بەهێمنیوتی: گۆڤیندا من بێهوودە قسەناکەم، بەیانی لەگەڵ هەڵهاتنی کازیوەدا وەک "سامانا"یەک بەجۆرێکیتر ژیان دەسپێدەکەم، ئێستە وازبێنە با لەمبارەیەوە قسەوباس نەکەین. سیدهارتا هاتە ئەو ژورەی کە باوکی لەوێ لەسەر حەسیرێکی جوان دانیشتبوو، بەهێمنی لەپشتی سەریەوە ڕاوەستا تاوەکو باوکی هەست بەئامادەبوونی ئەو بکات.

باوکی وتی: سیدهارتا... تۆی؟ دەی بڵێ... بزانم چیت دەوێو چ





شتێکت لەخەیاڵدایە؟

سیدهارتا وتی: ئەی باوکی من هاتووم پێتبڵێم بەیانی ماڵئاوایی لەماڵەکەی تۆ دەکەمو پەیوەندی دەکەم بەزاهیدەکانەوە... بەو ئومێدەوە دەڕۆم کە ببمە "سامانا"، بۆیە هیوادارم لەم کارەدا باوکم سەرپێچی نەکات، باوکی بەهەرەمەندی بەدانیشتنەوە لەحاڵەتی بێدەنگیدا ئەوەندە دانیشت تاوەکو ئەستێرەکان لەقەراغی پەنجەرەکەوە ئاوابوونو بەشێوەیەکیتر دەرکەوتن. کوڕەکەشی لەحاڵەتی بێدەنگیداو دەست لەسەرسنگ وەستابوو، باوکیشی بێدەنگو بێجووڵە لەسەر حەسیرەکە دانیشتبوو، ئەستێرەکان ئاسمانیان جێدەهێشتو لەپڕ بێدەنگی ژوورەکە شکا، براهما هاتە قسەو وتی: جوانخاسێک کە قسەی توندو ناشرین لەسەر زمانی بێت، شایەنی ئەوەنیە ببێتە براهما، مادام هەوری نارەزایی دڵی گرتووم، نامەوێ جارێکیتر ئەم خواستو داواکاریە ببیستم.

براهما بەهێمنی هەستایە سەرپێیو سیدهارتاش هەر بەوشێوەیە کە وەستابوو، بێدەنگو دەست لەسەرسنگ مایەوە.

باوکی پرسی: چاوەڕێی چیت؟

سیدهارتا وەڵامی دایەوە: تۆ خۆت ئەزانی چیم دەوێ؟

براهما هەر بەو نارازی بوونەوە ژورەکەی بەجێهێشتو ڕۆیشتە سەر چرپاکەی خۆی.

کاتژمێرێک تێپەڕیو خەوی لێنەکەوت، لەجێگاکەی خۆی هەستاو سەروخوار کەوتە هاتووچۆو لەماڵ هاتەدەرەوە، سەیری پەنجەرەی ژوورە نەشمیلو خنجیلانەکەی کردوو بینی هێشتا سیدهارتا بەهەمان شێوەی پێشوو دەست لەسەرسنگ وەک پەیکەرێک ڕاوەستاوەو جلە

بێرەنگەکانی لەبەر ڕۆشناییەکی لاوازدا دەدرەوشێنەوە، مەلولیو دڵتەنگیەک دایگرتو گەڕایەوە سەر چرپاکەی. کاتژمێرێکی تر تێپەڕیو براهما نەیتوانی بخەوێت، دووبارە هەستایە سەرپێو سەروخوار کەوتە هاتووچۆو لەو ماڵە ڕۆشتە دەرەوە، سەیریکرد مانگ هەڵهاتووە، دووبارە سەیری پەنجەرەکەی کردەوە، سیدهارتای بینی بێجوڵە دەستەکانی بەسنگیەوە گرێدراونو بەپێوە وەستاوەو ڕۆشنایی مانگ بەسەر بازووە ڕوتەکانیەوە شەوق دەداتەوە، غەمبارییەک دڵیگرتو گەڕایەوە سەر چرپاکەی.

پاش کاتژمێرێکیتر، دووبارە گەڕایەوە... پاش دوو کاتژمێریتر دیسان ئەم کارەی دووبارە کردەوە، هەردوو جارەکە سەیری پەنجەرەکەی کردوو سیدهارتای بینی کە لە ڕۆشنایی مانگەشەودا، لەنوری ئەستێرەکانداو لەتاریکیو لەهەمان شوێندا بێجوڵە وەستاوە، ئاگری تورەییو ترسو غەمباریو شپرزەیی دڵیگوشی. لەدواکاتژمێری ئەو شەوەداو بەر لە کازیوە گەڕایەوەو ڕۆشتەوە ماڵە خنجیلانەو نەشمیلەکەی خۆی، سەیریکرد هێشتا ئەو لاوە بەهەمان شێوە بەپێوە وەستاوە، وەک کەسێکی بالا بەرزو نامۆ هاتە پێش چاوی.

براهما وتی: سیدهارتا بۆچی چاوەڕوان دەبیت؟

سیدهارتا: تۆ خۆت باشتر دەزانی.

- دەتەوێ بەوجۆرەو لەوشوێنەدا کە بەپێوە وەستاویت، هەروابیت، تا ئەوکاتەی خۆرهەڵدێو بەیانی ڕۆژ دەبێتەوەو دیسان کاتێک ڕۆژ ئارەزوی شەو دەکاتەوە؟

- من بەپێوە دەبمو دان بەخۆما دەگرم.





- ئاخر سیدهارتا سەر ئەنجام ماندوو دەبی.

- ماندوو دەبم.

- سیدهارتا تۆ خەوت لێدەکەوێت.

- نەخێر خەوم لێناکەوێت.

- سیدهارتا تۆ دەمری.

- ئامادە دەبم بۆ مردن.

- کەواتە مەرگ بە گرنگتر دەزانی لەگوێڕایەڵی کردنی باوک؟

- سیدهارتا... هەمیشە گوێڕایەڵی باوکی بووە.

- لەم حاڵەتەدا ئیرادەت ناگۆڕی.

- سیدهارتا باوکی هەرچیەک بڵێ بەجێی دێنێ.

یەکەمین ڕۆشنایی بەیانی بەناو ژورەکەدا درەوشایەوە، کاتێک براهما بینی ئەژنۆکانی سیدهارتا کەمێک کەوتونەتە لەرزین، بەڵام لەگۆنایدا لەرزینێک بەدی ناکرێتو چاوەکانیشی سەیری شوێنە دوورەکان دەکەن، ئەوسا براهما تێگەیشت، چیتر سیدهارتا ناتوانێت لەوە زیاتر لەگەڵیدا بمێنێتەوە، بەباشی بۆی ئاشکرابوو کە سیدهارتا وازی لێهێناوە، ئەوکاتە دەستی هێنا بەشانیداو وتی "تۆ دەچیتە دارستانو دەبیتە "سامانا"، ئەگەر لەدارستاندا ئاسودەییت بەدەستهێنا، بگەڕێرەوەو منیش فێری ئەو ڕازو نهێنیە بکە، ئەگەر سەرابیشت بینیو نائومێد بووی، هەر بگەڕێرەوە بۆ لای من، ئەوکاتە بەڕەزامەندیو بەڵێنی هەردووکمان، بەئەندازەی بەهای ڕۆحمان، "فدیە" دەبەخشینە خوداکان، ئێستا برۆ دایکت ماچ بکەو پێی بڵێ کە بۆ کوێ دەچیت، هەروەها کاتی ئەوەش هاتووە من بچمە سەر ڕووبارو یەکەمین دەستنوێژو پابوونەوەی بەیانیان بەجێبێنم".

دەستی لەسەر شانی کوڕەکەی لابردو ڕۆشتە دەرەوە، سیدهارتا کاتێ کەوتە ڕێ، لارەلار بەم دیوو بەو دیوا دەکەوت، بەهەر شێوەیەک بوو، جموجۆڵەکانی خستە ژێر ئیرادەی خۆیەوەو سەری ڕێزی بۆ باوکی دانەواندو بەپەلە چووە لای دایکی تاوەکو ئەوەی کە باوکی پێیوت، جێبەجێی بکات، کاتێ بەئەژنۆ ماندوو،و لەرزۆکەکانیەوە بەهێمنی لەو شارە دوورکەوتەوە، هێشتا بەتەواوی خۆر لەخەو هەڵنەستابوو، لەو سپێدەی بەیانیەداو لەپشت دواهەمین ماڵۆچکەی شارەوە، لارە سێبەرێک دوایکەوت، ئەویش گۆڤیندابوو، سیدهارتا زەردەخەنەیەکی کردوو وتی: دواجار هەرهاتی؟.

گۆڤیندا وتی: بەڵێ هاتم.

***





# لە کۆڕی زاهیدەکاندا

شەوی ئەو ڕۆژە، گۆڤینداو سیدهارتا خۆیان گەیاندە کۆڕی زاهیدەکانو داوایانکرد خواستی هاوڕێیەتیو پەیمانی دۆستایەتیان قەبوڵ بکرێت، لەخۆبوردەییو خواستی هەردووکیان پەسەندکراو کەوتنە بازنەی زاهیدەکانەوە.

سیدهارتا جلەکانی خۆی بەخشی بە براهمایەکی هەژاری سەر ڕێگاکەیو تەنها پارچە قوماشێکی کەمەربەندو پارچە قوماشێکی نەدوراوی خاکی ڕەنگی هێشتەوە بۆخۆی، لەڕۆژێکدا یەک ژەم نانی دەخواردو بەهیچ شێوەیەک شتی ئامادەکراوی بەکارنەدەهێنا. ئەوماوەیە چواردە ڕۆژ ڕۆژوی گرتو پاشان بیستو هەشت ڕۆژیتر بەڕۆژوو بوو، گۆشت بەدەموچاوو لاقەکانیەوە نەما، خەیاڵاتی سەیروسەمەرە لەچاوە گەورەو کراوەکانیدا بەدیدەکرا، نینۆکی پەنجە باریکەکانی درێژبوون، ڕیشی زبروو دڕشتی لەسەر چەناگەی دەرکەوت، بەنیگایەکی ساردەوە تەماشای ژنانی دەکرد، بەبینینی خەڵکی ڕێکپۆشی شار، لێوەکانی بچوک دەبوونەوەو تەنیا دەکەوتنو دەلەرزین، هەموو ئەوشتانەی بینی کەچۆن کاسبکاران سەرگەرمی کاسبیکردنن، شازادەکان دەچن بۆ ڕاووشکار، ماتەمباران سەرقاڵی پرسەو ماتەمینی دۆستە لەدەست چووەکانیانن، سۆزانیەکان جەوهەری میهرەبانیو پاکیزەیی خۆیان دەفرۆشن، پزیشکەکان خەریکی چارەسەرکردنی نەخۆشەکانن، کاهینەکان ڕۆژی تۆو وەشاندن دیاریدەکەن بۆ جوتیاران، دایکان سەرمەستی دڵدانەوەو

ئاسودەکردنی مناڵەکانیانو عاشقەکان خەریکی عەشقبازین، ئەمانە هەموویان نرخی یەک نیگاکردنیان نەبوو، هەموویان درۆزن بوون. سیدهارتا هەستی بە نوکتیژی ئەو هەموو درۆیانە دەکرد، هەموو ئەمانەی بەجادووی هەستەکان دەزانی، هەموو شادیو جوانیەکان مەحکوم بوون بە ونبوونو لەناوچوون، جیهان جگە لە تەمومژ، ژیان جگە لە ڕەنجو ماندوبوون، هیچیتر نەبوو.

سیدهارتا تەنها یەک ئامانجی هەبوو، خوازیاری ئەوەبوو ئازادبێتو خۆی لەتینوێتی سوتێنەری مەیلو ئارەزوەکانو چێژوو میحنەتەکان ڕزگاربکات. ئارەزووی دەکرد چیتر هەولبداتو بهێڵێت نەفسی بمرێتو بەکوشتنی نەفسیش چێژوو خۆشیو ئازادبوونی دڵ بەدەستبهێنێتو خەیاڵێکی پاکی هەبێت.. ئامانجی ئەو بەس تەنها ئەوەبوو.

کاتێک کەنەفس نەماو دەستەمۆکراو هەواو هەوەسەکانی دامرکانەوە، ئەوکاتە چیتر ویژدانی ناوەوە پابەندی نەفس نیەو بێدار دەبێتەوە، لای سیدهارتا ئەمە بوو ڕازو نهێنی خەڵوەتکێشان.

سیدهارتا بەبێدەنگی لەژێر نوری سوتێنەری خورەتاودا ڕاوەستاو لەمەینەتو تینوێتیو سوتانی خۆر تێگەیشت، لەو حاڵەتەدا ئەوەندە مایەوە تاکو مەینەتو ئازاری تینوێتی لەناوچوو، لەژێر باراندا بەو بێدەنگیەوە بەپێوە ڕاوەستاو ئەوەندە مایەوە تاوەکو پشتو سەرشانو بازووە سەرما بردووەکانیو تاڵە مووەکانی، دڵۆپ دڵۆپ باراناویان لێچۆڕا، ئەو زاهیدە لاوە ئەوەندە بەوشێوەیە لەسەر پێکانی مایەوە، چیتر هەستی بەزەحمەتو ئازاری سەرمای شانو پشتو بازوەکانی نەدەکرد، وەک ئەوەی بەستبێتیو ئارامو بێدەنگ بووبێت،





لەحاڵەتی بێدەنگیدا ڕۆشتە ناو تیغو درکو داڵەکانەوە، لەپێستی وشکو پڕ لەئازاریەوە سەرەوخوار خوێن فیچقەی کردوو برینەکانی دەرکەوتن، سیدهارتا بێدەنگو بێجوڵە مایەوە هەتاکو چۆڕاوی خوێنی تەواوبوبوو، ئیتر نەهەستی بەسوتان دەکردوو نەدەردو ئازاریش مابوو.

سیدهارتا ئەیتوانی ڕاستەوخۆ دانیشێت، فێربووبوو چۆن هەناسەکانی بخاتە ژێر ئیرادەی خۆیەوەو کەمتر دەمبەرێت بۆ خواردنو دەمپارێزی بکات، فێری ئەوەبوو چۆن لەگەڵ دەم بردنیدا، لێدانی دڵیشی ئارامو بێدەنگ بکات، فێربوو چۆن لێدانەکانی دڵی کەمتر بکاتەوەو بەلێدانێکی کەم ڕایبهێنێت.

سیدهارتا لەڕێگەی بیرکردنەوەو کوشتنی نەفسی خۆیەوە، لەپەنای پەندو ئامۆژگاری ڕابەرە پیرە زاهیدەکاندا هەستا بەدەستێوەردانی نەریتی زاهیدەکان، ڕۆژێک ماسی خۆرەیەکی بینی بەسەر قامیشەڵاندا دەفڕیو دەسوڕایەوە، سیدهارتا باڵندەکەی لەڕۆحی خۆیدا جێگیرکرد، خۆی کرد بەو باڵندەیەو زمانی ئەوانیشی بەکارهێناو بوو بە ڕاوچی ماسیەکان، وەک برسیەتی ئەو باڵندانە لە ئازاری برسیەتیدا مەینەتێکی زۆری کێشاو پاشان وەک ماسی خۆرەیەک کەوتە گیانەڵاو خەریک بوو بمرێت، تارۆژێ چەقەڵێکی مردووی بینی لەسەر زیخی کەنار ڕووبارێک کەوتووەو پاشان چووە جەستەی چەقەڵەکەوەو مرد، هەروەها لەسەر زیخی کەنار ڕووبارەکە جێگیربوو، دوای ئەوە ئاوساو بۆنی کردو گەنیو کەمتیارەکان هاتن پارچە پارچەیان کرد، قەلەڕەشەکان بە دەنوک پارچەکانی لەشیان کێش کردو لەپەیکەرە ئێسکێک زیاتر هیچی تری نەمایەوە. پاشان بوو بە خۆڵو تێکەڵ بوو بە هەواو جارێکیتر ڕۆحی سیدهارتا گەڕایەوە، مرد.. ڕزیو بوو

بەخۆڵ.

بەم جۆرە، ئەزمونکردن ڕێگای پێبەخشیو لەمەینەتو ئازاری چرکەساتەکانی ژیانی تێگەیشتو بە تینوویێتیەکی تازەوە دانیشت، وەک ئەو ڕاوچییەی کە لە داوگەکەیدا دادەنیشێتو چاوەڕوانە، چاوەڕوانی کۆتایی دەورانی ژیانی، واتە چاوەڕوانی ئەو ساتەوەختەی کەتێیدا هەموو "عیلەتەکان" نامێنو دەڕەوێنەوەو ئەبەدیەت بە بێمەینەتو ئازار دەستپێدەکات.

سیدهارتا هەستەکانی خۆی نەهێشتو بیرەوەریەکانی خۆی لەناوبردو لەنەفسی خۆی چووە دەرێ، بەهەزاران شێوەی جیاجیا خۆی نواند، بوو بەئاژەڵ، بوو بەلاشە، بوو بەبەرد، بوو بەدار، بوو بەئاو، گۆڕا بۆ هەموو شتێکیتر، لەگەڵ هەموو چاوکردنەوەیەکدا خۆرو مانگی بەدرەوشاوەیی دەبینی، لەهەموو ساتەکانی ژیانیدا لەسوڕانەوەیەکی بەردەوامدا خۆی بینیەوە، تینووی بوو تینوویێتی لەناوبرد، دووبارە تینووی بووەوە، لەزاهیدەکانەوە فێری زۆر شت بوو، فێری ڕێگا جیاوازەکانی کوشتنی نەفس بوو، بەئازارو میحنەتەوە گەڕا بۆ ڕێگای ڕەتکردنەوەی بوون، بەرگەی مەینەتو ئازارەکانی گرتو بەبرسیەتیو تینوێتیو ماندووبونەوە زاڵبوو بەسەریاندا، لەڕێگەی ڕەتکردنەوەی نەفسەوەو لەڕێگەی ئەندێشەو بیرکردنەوەو پابونەوەی دەرونەوە گەڕا بەدوای هەموو شێوەو ڕوخسارو وێناکردنێکدا، ئاشنای نهێنی ڕێبوارەکانی ئەم ڕێگایەو ڕێبواری ڕێگاکانی دیکەبوو. ڕۆژی هەزاران جار نەفسی لەدەست دەداو دەکەوتە جیهانی نەبوونەوە. هەرچەندە ئەو هەموو ڕێچکەو ڕێگایانە سیدهارتایان لەنەفس دووردەخستەوە، بەلام دواجار هەر





دەیانگەڕاندەوە بۆ نەفس، گەرچی هەزارانجار لەنەفس هەڵهاتو لەجیهانی نەبووندا نیشتەجێبوو، چووە ناو پێستیئاژەڵەکانو بەردەکانو مادەسڕو بێ ڕۆحەکانەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا گەڕانەوەی چارەسەرنەبوو، چ لەخۆرەتاو چ لەمانگەشەودا، چ لەبارانو چ لەسێبەردا دووبارە خۆی دەبینیەوەو دەگەڕایەوە بۆ خودی خۆیو سەرلەنوێ باری قورسو ناهەمواری ساتەکانی ژیان، ئازاریان دەدایەوە.

گۆڤیندا وەک سێبەرێک هەمیشە لەتەنیشتیەوە بوو، ئەویش ڕێگاکانی هەموو تاقیدەکردەوەو دەگەڕا، بەردەوام لەو هەوڵو کۆششەدابوو، بەتایبەت لەشوێنی عیبادەتو سروتە ڕۆحیەکاندا بەدەگمەن لەگەڵ یەکتردا قسەیان دەکرد. هەندێ جار بەڕەزامەندی هەردووکیان دەچوونە ئاوایی، بۆئەوەی ژەمە خواردنێک سواڵبکەن بۆ خۆیانو مامۆستاکانیان.

لەیەکێک لەو ڕۆژانەی سواڵکردندا، سیدهارتا لەدۆستەکەی پرسی: گۆڤیندا چی بەخەیاڵتا دێت؟ ئایا پێتوایە پێشڕەویەکمان کردبێت؟ ئایا ئێمە گەیشتوین بەمەرامو ئامانجی خۆمان؟ گۆڤیندا وەڵامیدایەوە: ئێمە شتگەلێک فێر بووینو پێویستیشە بەردەوام فێربین، سیدهارتا! دەزانم تۆ دەبیتە "سامانا"یەکی مەزن، بەوپێیەی زۆر بەخێرایی ئاشنای ئەزمونە ڕۆحیەکان دەبیت، بۆیە ئەو "سامانا" پیرە مورشیدەی ئێمە، تۆ ئاسودەو سەرفرازدەکات، ئەی سیدهارتا ڕۆژێ دەبیتە پیاوێکی پیرۆز.

سیدهارتا وتی: من بەوشێوەیە خۆم نابینم کە تۆ باسیدەکەی، ئەوەی تاوەکو ئێستا ئێمە لەزاهیدەکانەوە فێریبووین، دەمانتوانی لە

کونجی هەموو مەیخانەیەکو لە ماڵۆچکەی هەموو سۆزانیەکو لەناو مەکربازوو قوماربازەکانیشدا زۆر زووترو باشتر فێربیین.

گۆڤیندا وتی: سیدهارتا شۆخیدەکات، چۆن دەتوانێ ئەو بیرکردنەوە مەزنانە، ئەو ڕیگریە سەختەی نەفس، یان وێرانکردنی هەستەکان، لەناو برسیەتیو زەحمەتکێشاندا لەو بەدبەختانەوە فێربێت؟

– سیدهارتا بەم شێوەیە قسە لەگەڵ خۆی دەکاتو بەئارامیەکەوە وتی: بیرکردنەوە چیە؟ وازهێنان لەجەستە چیە؟ ڕوژوگرتن چیە؟ دەمپارێزی چیە؟ ئەمانە هەموویان دەبنە مایەی هەڵهاتن لە نەفس، ئەمەش ڕزگاربونێکی کاتیە لەئەشکەنجەی نەفس، ئاسودەییەکی کاتیە لەمەینەتو نائومێدیەکانی ژیان، گالیسکەوانێک کاتێ سەردەکات بەکۆنە مەیخانەیەکدا، چەند تێربێت لەشەرابو شیری "نارگیل"، تەنها لەو حاڵەتی خۆمەستکردنە کاتیەدا ماوەیەک سودمەندە، چیتر ئەویش لەوکاتەدا هەست بەنەفس ناکاتو بێئاگایە لە ئازارو مەینەتی ژیان، ئەویش ئازادیو ڕزگار بونێکی کاتی بەدەستدەهێنێت، بەڵام پاش شەراب خواردنەوە، کاتێک کە خەوی لێکەوت، ئەویش تەنها ئەوە بەدەستدەهێنێت کە سیدهارتاو گۆڤیندا دوای ئەزمونێکی ڕۆحی دوورو درێژو کەنارگیری لەنەفسو هەستکردن بەخود، بەدەستیدەهێنن، پاشان دەکەونەوە ناو جیهانێکی وێران.

گۆڤیندا وتی: ئەی دۆستی من تۆ ئاوا بەوشێوەیە قسەدەکەیت، بەڵام باش دەزانی سیدهارتا نابێتە هیچ گالیسکەوانو زاهیدێکی مەیخۆر، گەرچی ئەوەی شەراب دەنۆشێ خۆی قوتاردەکاتو بۆ چرکەساتێکیش بێت، خۆی بەئازادو ئاسودە دێتە پێشچاو، بەڵام





دواجار دەگەڕێتەوە بۆ جیهانی خەیاڵاتو هەموو شتێکیش وەکو پێشتری لێدێتەوە، بەڵام مەعریفەی ئەوکەسە هیچ شتێکی زیادی نەکردوەو هیچ حیکمەتێکیش فێرنەبووەو پلەیەک بەرەوپێش نەچوەو سەرنەکەوتووە.

سیدهارتا بەزەردەخەنەی سەر لێوانیەوە وەڵامیدایەوە: من ئەمانە نازانم، چونکە هیچ کاتێک مەیخۆر نەبووم، بەڵام من کە سیدهارتام لەتەواوی بیرکردنەوەو ئەزمونە ڕۆحیەکانی خۆمدا، تەنها بۆ چرکەساتێکی زۆر کورتیش بێت، ڕزگاریی بەدەستدەهێنم. منیش وەک ئەو "کۆرپە"یەی کە لەسکی دایکێکدایە، دوورم لەحیکمەتو ڕزگاربوون، ئەی گۆڤیندا ئەمانەن ئەو خواستانەی کە من دەیانزانم.

ڕۆژێکیتر سیدهارتاو گۆڤیندا لەدارستان چووبوونە دەرەوە بۆ ئەوەی خواردنی خۆیانو هاوڕێکانیانو مامۆستاکانیان سواڵبکەن، سیدهارتا کەوتە قسەکردنو وتی: باشە.. گۆڤیندا.. ئایا ئەو ڕێگایە ڕاستە کە ئێمە گرتوومانەتە بەر؟ ئایا ئێمە حیکمەتێکمان دەسکەوتووە؟ ئایا ڕزگارمان دەبێت؟ یان تەنها ئەوەیە ئێمە لە بازنەیەکداینو ڕێگا دەبڕینو دەگەڕێین؟ ئاخر... ئێمە تەنها بیرماندەکردەوەو پێمان وابوو لەژیان هەڵدێین؟ گۆڤیندا وتی: سیدهارتا.. کۆمەڵە شتێکی زۆر فێربووینو شتگەلێکی زیاتر ماوە کە فێریان بینو بیانزانین، ئێمە لەیەک بازنەدا ناسوڕێینەوە، بەڵکو بەرەو قەڵایەک دەڕۆینو پێشڕەوی دەکەین، ڕێگەی ئێمە سەختو ئاڵۆزو پڕ نشێوو هەورازە، تائێستاش پلیکانەی زۆرمان بڕیوەو تێمانپەڕاندووە، سیدهارتا وتی: باشە بە بڕوای تۆ پیرترین زاهیدی ئێمە، بۆ نمونە ئەو مامۆستا مەزنو بەهادارە تەمەنیچەند ساڵ بێت؟

گۆڤیندا وەڵامیدایەوە: پێموایە پیرترینیان تەمەنی شەست ساڵ بێت.

سیدهارتا وتی: ئەو شەست ساڵ تەمەنیەتی‌و هێشتا نەگەشتوەتە "نێرڤانا"، ئەو دەبێتە حەفتا ساڵو هەشتا ساڵ، منو تۆش بەهەمان شێوە پیردەبین‌و هێشتا هەر سەرگەرمی ئەزمونە ڕۆحیەکان دەبین‌و بیردەکەینەوە، بەڵام نە ئەوو نەئێمەش هیچکاممان ناگەینە مەنزڵو ناگەینە پلەی "نێرڤانا". گۆڤیندا بەبڕوای من، لەناو زاهیدەکاندا تەنانەت تاقە کەسێکیش نەگەشتوەو ناشگات بە "نێرڤانا"، ئێمە دان بەخۆماندا دەگرین‌و دڵی‌خۆمان خۆشدەکەین، فێری ئەوەش دەبین چۆن خۆمان بخەڵەتێنین، بەڵام ئێمە ئەو مەبەستە سەرەکیەو ئەو ڕێگایە بەدەست ناهێنین.

گۆڤیندا وتی: ئەو جۆرە قسانە مەخەرە سەرزمانت کەدەبنە مایەی غەمباری‌و دڵتەنگی، چۆن دەبێت لەناو ئەو هەموو پیاوە حەکیم‌و براهماو زاهیدە بەنرخو زەحمەتکێشانەداو لەناو ئەو هەموو گەڕیدەو کەسانەدا کەخۆیان کردوەتە قوربانی ژیانی واقعی‌و لەناو ئەو هەموو پیاوە پیرۆزانەدا تەنانەت تاقە کەسێک ڕێگای ڕاستی نەدۆزیبێتەوە.

سیدهارتا بەو دەنگەوە کە هەڵگری زەنگی غەم‌و گاڵتەجاڕی بوو، بەهێمنیەوەو بەغەمگینیەکی تێکەڵاوو گاڵتەجاڕیەوە وتی: ئەی گۆڤیندا... دۆستەکەی تۆ بەزوویی ئەو ڕێگەیە جێدەهێڵێت کەماوەیەکی دوورو درێژ لەگەڵ تۆو زاهیدەکاندا دەگەڕاو بیری دەکردەوە، ئەی گۆڤیندا.. من لەتینوێتیدا مەینەتدەکێشم، ئەم ڕێگا دورودرێژەی خەڵوەتکێشانیش ئاگری تینوێتی منی دانەمرکاندوەتەوە، من تینوی حیکمەتم‌و پابەندم بەو پرسیارانەوە کە لە بوغچەی سینگی مندان، ساڵەهای ساڵ پرسیارم لە براهماکان کرد، ساڵەهای ساڵ لەناو





"ڤیدا"ی پیرۆزدا عەوداڵی وەڵامەکانیان بووم، بەڵام ئەی گۆڤیندا ئەگەر لە کەرکەدەنەکانی بیابان‌و مەیمونەکانی دارستانیش پرسیارم بکردایە ئاوا بەو باشیە وەڵامێکم دەبیست، ئەی گۆڤیندا.. دەورانێکی دوورو درێژم بردە سەرو هێشتا بەردەوامیشم تاوەکو ئەوە بەدەستبهێنم کەمرۆڤ بەگەڕان ناتوانێت شتێکی ئەوتۆ بەدەستبهێنێت، ئەی دۆستی من، من لەو باوەڕەدام لەناو ڕۆحو جەوهەری بوونەوەرەکاندا شتێک هەیە هەرگیز ناتوانین بەحیکمەتی بزانین، تەنها یەک جۆر حیکمەت بوونی هەیە کە لەهەموو شوێنێکدا هەیە، ئەویش " ئاتمان"ە، کە لە مندا، لە تۆداو لەهەموو بونەوەرێکدا ئامادەگی هەیە، لەناو دوژمنەکانی ئەم حیکمەتەشدا هیچیان هێندەی زانستی زانایان خراپو بەدکار نیە، ئەمە بیرو بۆچوونی منە.

لەوکاتەدا گۆڤیندا لەناوەڕاستی ڕێگاکەدا بێدەنگ وەستاو دەستەکانی بەرزکردەوەو وتی: بەم جۆرە قسانە گۆڤیندای دۆستت پەرێشان مەکە، بەڕاستی قسەکانت شپرزەم دەکەن. بیر لەوە بکەرەوە بۆئەوەی ئەوە ببینی کە چۆن شکۆو گەورەیی براهماکان‌و پیرۆزی زاهیدەکان هەمووی لە واتاو مەبەستەکانی دوعاو نزای پیرۆزی ئێمەدا پەنهانە، بەوجۆرەی کە تۆ دەڵێیت، ئەگەر حیکمەتێک بوونی نەبوایە ئەوکاتە ئەنجام‌و چارەنوسی ئەم هەموو شتانە چی دەبوو؟ دەبوو ئەوکاتە چ شتێکمان بەپیرۆز بزانیباو چ شتێک بەهای دەبوو؟ گۆڤیندا بەهێمنی ئەم کۆپلەی "ئوپانیشادها"ی بۆ خوێندەوە "ئەو کەسەی ڕۆحی پاکی نوقم بێت لەئاتماندا ئاسودەییەک بەدەستدەهێنێت کە وشەکان نەتوانن پێناسەی بکەن".

سیدهارتا بێدەنگ بوو، بیری لەو قسانە دەکردەوە کە گۆڤیندا

پێیوتبوو، بەڵێ ئەو بیرکردنەوەیەکی قوڵ بردبووی، سەری لاربووبوەوە بۆ خوارەوەو بیری لەوە دەکردەوە لەناو ئەو هەموو شتانەدا کە لای ئەو پیرۆزن چ شتێک دەمێنێتەوە؟ چ شتێک بۆ هەمیشە پایەداردەبێت؟ دوایئەوە سەری هەڵبڕی.

سێ ساڵ دوای ئەوەی کە ئەو دوو لاوە لەگەڵ زاهیدەکاندا بەسەریان بردبوو لەکردەوەو ئەزمونە ڕۆحیەکانیاندا بەشداریان کردبوو، ڕۆژێکیان لەچەند سەرچاوەیەکی جیاوازەوە هەواڵو دەنگو باسێکی بڵاویان بەرگوێ کەوت، گوایە کەسێک دەرکەوتوە بەناوی "گۆتاما"ی حەکیم، یان "بودا"وە، ئەم کەسایەتیە مەزنە بارگرانیو ئازارو مەینەتیەکانی جیهانی لەناوبردووەو کۆتایی بەساتەوەختەکانی گەڕانەوە هێناوەو چوەتە گوندەکانەوەو پەندو ئامۆژگاری دەبێژێو موریدەکان چواردەوریان گرتووە، خۆشی بەبێ هیچ پەیوەندیو وابەستەگیەکو بێماڵو بێژن کراسی زەردی خەڵوەتکێشانی پۆشیوەو بەسیمایەکی پرشکۆوە وەک پیاوێکیپیرۆز بەهەموو شوێنێکدا دەگەڕێو براهماو شازادەکان لەبەردەمیا لەگەورەیی دەکەونو لەڕیزی قوتابیەکانیدا خۆیان دەبینەوە.

ئەم هەواڵو دەنگو باسە گەشتە هەموو شوێنێکو لەهەموو لایەک بیستراو بڵاوبوەوە، براهماکان لەشارداو زاهیدەکان لەدارستاندا لەبارەی ئەو پیاوەوە گفتوگۆیان دەکرد، ناوی "گۆتامای بودا" گەشتە گوێی ئەم دوو لاوەش، هەرچیەک دەگوترا دەربارەی بودا، باش یان خراپ، ستایش یا ڕەخنەو سەرزەنشت، هەمووی دەگەشتەوە گوێی گۆڤینداو سیدهارتاو دەیانبیستەوە، وەک ئەوەوابوو تاعون بڵاوبێتەوەو ناوچەیەک بگرێتەوەو بڵێن لەفلان جێگەش پیاوێکیحەکیم





پەیدا بووەو بەرەکەتی دەرونیو وشەکانی شیفاو چاکبوونەوە دەبەخشێت بە توشبووەکانی، هەواڵەکەش بگاتە هەموو شوێنێکو خەڵکیش بکەونە گفتوگۆ دەربارەی، کۆمەڵێک باوەڕی پێبهێننو کۆمەڵێک ڕەتیبکەنەوە، کۆمەڵێک بڕۆن تاوەکو بەپەلە خۆیان بگەیەنن بەو حەکیمە چاکەکارە، بەو شێوەیە ئەم هەواڵەی "گۆتامای بودا"ش ئەو حەکیمەی کە لە نەژادی "ساکیا" بووە، بەدەر لەم ناوچە تایبەتەش گەشتبووە هەموو شوێنێکیتر، پەیڕەوانیئەو پیاوە دەیانوت: خاوەنی زانیاریەکی زۆرە، دەیانوت بودا بەباشی سەرەتای لەدایکبوونیخۆی لەبیرە، بۆیە دەڵێن گەشتوە بە "نیرڤانا"و چیتر نایەتەوە ناو سوڕی ژیان، لەڕووباری پڕ لە پێکدادانو خرۆشانو وێنەدا پەلەقاژێی نغرۆبوون ناکات، چەندین شتی نایابو بێوێنەیان لەبارەوە دەگوت، دەیانگوت خاوەنی موعجیزەیەو شەیتانی داگیرکردووەو لەگەڵ خوداکاندا قسەدەکات، دوژمنەکانیو ئەوانەی گومانیان لەسەر دروستدەکرد، دەیانگوت "گۆتاما" لە ڕیاکارێک زیاتر هیچیتر نیە، چونکە ڕۆژەکانی خۆی لەژیانێکی زۆر خۆشو شیرینا دەگوزەرێنێو بەچاوێکی سوکەوە تەماشای قوربانیەکان دەکاتو بەتەواوی دورە لەحیکمەتو زانیاریەوە، هەروەها هیچ زانیاریەکی نیە لەبارەی ئاوابوونو قەدەرەکانی جیهانەوە.

ئەم دەنگوباسو هەواڵانە، زۆر نایاب سەرنجیان ڕادەکێشاو سیحرێکی سەیریان تیابوو، جیهان غەمگینو ژیان سەخت بوو، ئاوا ئومێدێکی تازە پەیدا بووبوو، ئەم هەواڵو پەیامە وەک ئارام کەرەوەیەک، کاریگەرو ئومێد بەخش بوو. لەهەموو قسەکردنێکدا دەگەڕانەوە بۆ بوداو لەسەرتاسەری هیندستاندا پیاوانی گەنج بۆ

زیارەتکردنی ئەو، شەوقو زەوقێکی سەیریان تێدابوو، منداڵی براهماکانیش چ لەشارەکانو چ لەگوندەکاندا بەرامبەر هەر ڕێبوارو بێگانەیەک کەهەواڵێکی "ساکیامونی"ی حەکیم، یان گۆتامای بودای لابووایە، خۆشحاڵییان دەردەبڕیو بەگەرمی بەخێرهاتنیان دەکرد.

ئەم هەواڵە لەدارستاندا گەشتە گوێی زاهیدەکان، سیدهارتاو گۆڤینداش جاروبار ئەم باس‌وخواستەیان دەبیست، بەڵام کەمتر ئومێدیان بەو قسانەی ئەوان هەبوو، بەڵکو زیاتر بەگومانەوە تەماشایاندەکردنو لەو بارەشەوە زۆر کەم قسەیان دەکرد، پیرەزاهیدیش بەبیستنی ئەم هەواڵە ئەوەندە خۆشحاڵ نەبوو، چونکە بیستبووی ئەوکەسەی کە خۆی بە "بودا" دەزانێت، سەردەمانێک زاهید بووەو لەجەنگەڵدا ژیاوە. پاشان باوەڕی هێناوە بەکاروانە دنیاییەکانو ژیانێکی زۆر خۆشو جوانی بۆخۆی ڕێکخستوە کە پڕبووە لەچێژو نازو نیعمەت، بۆیە لای ئەو "گۆتاما" جێگەی ڕێزو ستایش نەبوو.

ڕۆژێک گۆڤیندا بەدۆستەکەی وت: سیدهارتا.. ئەمڕۆ کاتێ لەئاوایی بووم، براهمایەک دەعوەتی کردم کە بچم بۆ ماڵیان، کوڕە براهمایەک لەو ماڵەبوو، ئەو کوڕە خۆی لە "ماگادها" بووەو بەچاوی خۆی بودای بینیوەو بەگوێی خۆی پەندو ئامۆژگاریەکانیشی بیسبتوو، بەڕاستی دڵم پڕبوو لەتاسەو ئارەزو، ئارەزووی ئەوەم کرد خۆزگە منو سیدهارتا ئەوەندە زیندو ئەماین، ڕۆژێ ئەو پیاوە ببینینو پەندو ئامۆژگاریەکانی لەسەر لێوانی خۆیەوە بەگوێی خۆمان ببیستین، ئاە.. ئەی دۆستی من، خۆزگە ئەوەمان بۆ ڕیک دەکەوت، ئێمەش بچوینایە بۆ ئەوێو پەندو ئامۆژگاریەکانیمان لەدەمی خۆیەوە ببیستایە.





سیدهارتا وتی: هەمیشە بیرم لەوە دەکردەوە گۆڤیندا لەگەڵ"سامانا"کاندا دەمێنێتەوە، بیرم دەکردەوە ئامانجی ئەو ئەوەیە، کە تا شەست... حەفتا ساڵی لەو چالاکیو هونەرو ئەزمونە ڕۆحیانەدا بەشداربێت کە لە زاهیدەکاندا هەیە، ئەفسوس! چەند کەم ئەوم دەناسی، هیچ زانیاریەکم دەربارەی ئەوشتە نەبوو کە بەناو دڵی ئەوا تێدەپەڕی، ئەی دۆستی خۆشەویستی من ، ئێستا تۆ دەخوازی ڕێگایەکی تازە هەڵبژێریتو دەتەوێ بڕۆیتو پەندو ئامۆژگاریەکانی بودا ببیستی.

گۆڤیندا وتی: گاڵتەکردن بە من چێژت پێدەبەخشێت، بەڵام بەلای منەوە هیچ گرنگ نیە، باشە ئەی تۆ، خۆت هیچ تاسەو ئارەزوو زەوقێکت نیە بۆ بینینو بیستنی قسەکانی ئەو؟ مەگەر تۆ ڕۆژێک بە منت نەوت ئیتر ڕێگای زاهیدەکان تاقی ناکەیتەوەو چیتر ناگەڕێی؟

لەوکاتەدا سیدهارتا پێکەنیو لەپێکەنینەکەیدا زەنگی غەمو گاڵتەجاڕی دەبیستراو وتی: ئەی گۆڤیندا چەند جوانت وت، تۆ بەباشی هەموو شتێکت لەبیرە، بەڵام دەبێت ئەوەشت بێتەوەیاد کەدوای ئەوە وتم... وتم: چیتر من بەچاوی گومانەوە تەماشای هەموو پەندو ئامۆژگاریو ڕێنماییەکان دەکەمو باوەڕم بەو قسانە نیە کە لە مامۆستاکانەوە پێم دەگەن، بەڵام بەهەرحاڵ، من ئامادەم ئەم پەندو ئامۆژگاریو ڕێنماییە تازانە ببیستم، من لەدڵی خۆمدا یەقینم هەیە بەوەی کە تاوەکو ئێستا ئێمە خۆمان بەری ئەم فێربوونو ئامۆژگاریانەمان چەشتبێت.

گۆڤیندا وەڵامی دایەوە: زۆر سوپاست دەکەم بۆ ئەو ڕەزامەندیەی دەرتبڕی، بەڵام پێمبڵێ ئێمە کە هێشتا پەندو ئامۆژگاریەکانی

"گۆتاما"مان نەبیستوەو سودێکمان لێوەرنەگرتووە، چۆن دەتوانین قسەی لەسەر بکەین؟

سیدهارتا وتی: ئەی گۆڤیندا، باشە با تامی ئەو میوەیە بکەینو لەچاوەڕوانی ئەوانیتریشدا بمێنینەوە، یەکەمین میوەیەک کە ئێمە لەپێناویدا قەرزاری گۆتاما دەبین ئەوەیە کە ئەو.. ئێمەی فریوداوەو لەزاهیدەکان دورمان دەخاتەوە، ئەگەر میوەجاتی باشترو خۆشتر لای ئەو هەبێت، سەبرکە با دان بەخۆماندا بگرینو خوازیارو عەودالیئەوەبین.

سیدهارتا لەهەمان ڕۆژدا پیرە مورشیدی زاهیدەکانی ئاگادار کردەوە لە مەبەستو مەرامی خۆیو پێیوت: چیتر ئێمە بەجێدەهێڵین، سیدهارتا بەوشێوە ئەدەبو لەخۆبوردویەوە ئەم قسانەی ڕاگەیاند، کەشایستەی لاوەکانو قوتابیەکان بوو، بەڵام پیرە زاهید بە ڕقو کینەوە دەرپەڕیو بەشێوەیەکی ناشیرین گرتنیو بەڕویاندا هەڵشاخاو پەلاماریدان.

گۆڤیندا زۆر سەری سوڕما لەم کارەی پیرە مورشیدەکە، بەڵام سیدهارتا دەمی بردە لای گوێی گۆڤینداو پێیوت: ئێستا دەبێت من بەو پیرەمێردەی پیشاندەم کە من شتێک لەوەوە فێربووم ..

سیدهارتا لەبەرامبەر پیرە مورشیدەکەدا ڕاوەستاو لەچاوەکانی ڕاما، هەموو جوڵەو دیقەتو هەستێکی خۆی ئاڕاستەی ئەو کرد، بەتەماشاکردنو نیگایەکی خۆی، پیرە مورشیدەی کۆنترۆڵ کردو بێجوڵە ڕایگرتو لاڵیکردو هەموو ئیرادەی ئەوی داگیرکرد، بەبێدەنگی فەرمانی پێکرد ئەوەی کە سیدهارتا خۆی دەیەوێت ئەو.. بیکاتو ئەنجامی بدات، پیرە پیاو بێدەنگ بوو، چاوەکانی واق وڕمانو





ئیرادەی ئیفلیج بوو، دەستەکانی شۆڕبونەوە بۆ خوارەوە، بەتەلیسمەکانی سیدهارتا گرفتاربوو، هێزو توانای تیانەما، مێشکی سیدهارتا، بیرو بۆچونەکانی پیرە زاهیدی خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە، پاشان پیرە زاهید چەند جارێک سەری ڕێزی بۆدانەواندو بەزمانی لاڵەوە دوعای خێری بۆ کردو هیوای خواست کە سەلامەتو ئاسودەبن، لاوەکان سوپاسیان کردو وەڵامی ئەوستایشو پێزانینەیان دایەوەو ڕۆشتن.

لەڕێگادا گۆڤیندا وتی: ئەی سیدهارتا، تۆ لەوەی کە من دەیزانم زیاتر دەزانیتو لە زاهیدەکانەوە فێری بوویت، ئەزانی هیپنۆتیزەکردنی ساماناپیرەکان زۆر قورسو گرفتئامێزە، لەڕاستیدا ئەگەر لەوێ بمایتایەتەوە پێدەچوو ڕۆژێ فێری ڕۆشتنیش بوویتایە بەسەر ئاودا.

سیدهارتا وتی: هەرگیز مەیلی ئەوەم نیە بەسەر ئاودا بڕۆم، وازبێنە با زاهیدە پیرەکان بەهۆی زانینی ئەم جۆرە هونەرە خۆشانەوە خۆیان بپارێزن.

***

# گۆتاما

لەشاری (ساواتهی) هەموو کەسێ تەنانەت منالآنیش "گۆتاما"، یان بودای ناوداریان دەناسی، شوینکەوتوانی ئەو بە کەشکۆڵی دەرۆزەکردنیانەوە دەچوونە مالەکانەوە، بەبێدەنگیو بەویقارێکەوە داوای خواردنیان دەکردو هیچ کاتێکیش بەنائومێدیەوە نەدەگەڕانەوە.

گوتاما لەکەناری شارداو لەباغی "ئاناتهاپیندیکا" نیشتەجێ ببوو، هەروەها بازرگانێکی دەوڵەمەند، کەیەکێک بوو لە موریدەکانی ئەو، ئەم باغەی کردبووە دیاری گۆتاماو موریدەکانی.

دوو زاهیدە لاوەکەش کە بەدوای گۆتامادا دەگەڕان، سەرئەنجام لەڕێگەی پرسیارکردنو ئەو سۆراغو وەلامانەی کە دەستیان کەوتبوو، گەشتنە ئەو ناوچەیە. کاتێک کە گەیشتن بەیەکەمین ماڵی کەنار شاری ساواتهی، بەبێدەنگی دەستیان کرد بەسوالکردن، سیدهارتا لەماڵێک، پرسیاری لەو خانمە میهرەبانە کرد کە کەشکۆڵەکەی بۆ پڕکردبوون لەخواردن: ئەی خانمی بەڕێز.. ئێمە تامەزرۆی ئەوەین بزانین، بودا ئەو ناودارە مەزنە لەکوێ دەژی، دەبینی ئێمە دوو زاهیدینو دارستانمان جێهێشتووە، هاتووینەتە ئێرە بۆئەوەی ڕێنماییو پەندو ئامۆژگاریەکانی ئەو پیاوە مەزنو بێهاوتایە، ئەو پیاوە کامڵە، لەسەر لێوەکانیو زمانی خۆیەوە ببیستین، ژنەکە وتی: ئەی زاهیدە جەنگەڵیەکان، تائێرە ڕاست هاتوون، ئەو ناودارە





مەزنە، لەباغی "ئاناتهاپیندیکا" لە "جتاوانا" دەژیو نیشتەجێیە، ئێوە دەتوانن شەو لەوێ بمێننەوە، هەموو ئەو کەسانەی کە دێن بۆ زیارەتو بینینی ئەو، لەوێ دەمێننەوەو لەسەر زمانی خۆیەوە پەندو ئامۆژگاریو ڕێنمایەکانی دەبیستن.

گۆڤیندا دڵی شادبوو، بەخۆشحاڵیەوە وتی: چەند خۆشە بەمەرامی خۆمان گەشتووینو گەشتەکەمان کۆتایی هاتووە، بەلآم ئەی خانمی بەڕێز، ئەی دایکی پاکیزەی زیارەتکاران، پێمانبڵێ باهەر بزانین، ئایا تۆ بوودا دەناسی؟ بەچاوی خۆت ئەو پیاوەت بینیوە؟

ژنەکە وتی: چەندینجار زیارەتی ئەو پیاوە مەزنەم کردووە، زۆربەی ڕۆژەکان لەوکاتەدا دەیبینم، کە بەشەقامەکانی شاردا دەگەڕێ، جبەیەکی زەردباوی لەبەردایەو کەشکۆڵێکی بەدەستەوەیەو بەبێدەنگی دەچێتە بەردەرگای ماڵەکان بۆ سوالکردنی خۆراک، ئەوانیش هەموویان کەشکۆڵەکەی بۆ پڕدەکەن.

گۆڤیندا بەتوێشوویەکی پڕەوە گوێی لەم قسانە بوو، دەیویست پرسیاری زیاتربکاتو زیاتر لەم جۆرە قسانەش ببیستێت، بەلآم سیدهارتا بیریخستەوە کەچیتر کاتی ڕۆشتن هاتووە.

سوپاسێکی بێپایانی ئەو ژنەیان کردو بەڕێکەوتن، ئیتر پێویستیان بە پرسیارکردنی ڕێگاکە نەما، خەڵکانێکی زۆر لەو ڕەبەنو زیارەتکارانەی کە شوێنکەوتووی بوودا بوون، بەڕێوەبوون بەرەو "جتاوانا"، کاتێ گەشتنە ئەو شوێنە، شەو داهاتبوو، بەلآم لافاوی موریدو زیارەتکار هەر بەوجۆرە جمەی دەهاتو خەڵکانی تازەش بەردەوام پەیوەندیان پێوە دەکرد، جۆشو خرۆشێکی سەیر لەئاوازو دەنگی ئەو کەسانەوە بەرگوێ دەکەوت، کە داوای بوارو یارمەتیان

دەکردو بۆ پەناگەیەک دەگەڕان، ئەو دوو زاهیدە لاوەش کە بەژیانی دارستان ڕاهاتبوون، بەئاسانی پەناگەیەکیان دەسکەوتو ئەو شەوە تا بەیانی لەوێ مانەوە، بەیانی سەریان لەو حەشاماتە سوڕما، ئەو هەموو ڕەبەنو موریدو زیارەتکارو خەڵکەیان بینی، کەتەنها بۆ شارەزاییو گەڕان هاتبوونە ئەو باغەو شەو لەوێ مابوونەوە. ڕەبەنەکان بە جبەی زەردەوە بڵاوببوونەوە بەکۆڵانە جوانەکانی ئەو باغەی کە لە بەهەشتێک دەچوو. لەژێر هەموو درەختێکو لە هەموو گۆشەیەکەوە دەبینران کە سەرگەرمی مەسەلە ڕۆحیەکانو لەدنیای ڕامانو بیرکردنەوەدا نوقم بوون. ئەو باغە جوانە لەشارێک دەچوو کە پڕ بووبێت لەهەنگ، زۆربەی ڕەبەنەکان بە کەشکۆڵەکانیانەوە بەرەو شار دەکەوتنە ڕێ بۆئەوەی خواردنی نیوەڕۆیان سواڵبکەنو ئەو ژەمەش تەنها خواردنی ڕۆژێکیان بوو، تەنانەت بوداش هەر دەمەو بەیان خۆی گەیاندبووە شار بۆ سواڵکردنی ژەمە خواردنێک.

سیدهارتا بودای بینیو وەک ئەوەی خودا نیشانیدابێت، بە لاچاوێک تەماشای کردو چاوی لێبوو ئەو پیاوە کەشکۆڵێکی بەدەستەوەیەو دواتر بەهێمنی ئەو شوێنەی جێهێشت، بە جبە زەردەکەیەوە وەک پیاوێکی زۆر سادەو بێغرور کەوتە بەرچاو.

سیدهارتا بەهێمنی بە گۆڤیندای وت: سەیرکە، ئەوە بودایە.

گۆڤینداش بەسەرنجەوە سەیری ئەو ڕەبەنەی دەکردو دیاربوو جبەیەکی زەردی پۆشیبوو، لەناو ڕەبەنەکانی تردا جیا نەدەکرایەوە.

گۆڤیندا بوودای بینی... بەڵێ ئەو ڕەبەنە بودا بوو، پاشان هەردووکیان دوایکەوتنو زۆر سەیر تەماشایان دەکرد، بوداش ونبووبوو لەدنیای بیرکردنەوەداو بەهێمنی ڕێگای دەبڕی، لەڕوخسارە





ئارامەکەیدا غەمو شادی نەدەبینرا، وادیاربوو وەک منداڵێکی غەمگین لەناوەوە زەردەخەنە بیگرێ، لەئارامیو بێدەنگیدا بەڕێگادا دەڕۆیشت، جبەیەکی زەردی پۆشیبوو، وەک ڕەبەنەکانیتر کەوتبووە ڕێ، بەڵام شتێک جیای دەکردەوە لەوانیتر، ئەویش سیماو هەنگاوو نیگا ئومێد بەخشەکانی بوون، دەستەکانی خستبوونە لاوە، هەر پەنجەیەک لەپەنجەکانی حیکایەتێک بوو لە خۆشبەختی، هەمووشیان پێکەوە نەغمەی کامڵبونیان بەگوێدا دەچرپاند، ئەو پەنجانەی خوازیاری هیچ شتێک نەبوونو لاسایی هیچ شتێکیان نەدەکردەوە، سومبولی بێدەنگیەکی هەمیشەیی بوون، دوور لەتاریکی شەوقیان دەدایەوەو حیکایەتیان لەخۆشبەختیەکی بێگرفت دەکرد.

بەو شێوەیە گوتاما بەشاردا دەگەڕاو سەرگەرمی سواڵو خێر وەرگرتن بوو، دوو زاهیدە لاوەکەش ئەو پیاوەیان لەویقاری هەیکەلو جوانی ڕەفتاریەوە ناسیبوو، کەهیچ گەڕانو هیچ ئیرادەو ئامادەگیو زەحمەتێکی تێدا نەبوو، ئەوەی کە بەتەواوی ناسیویانە، ڕۆشناییو جوانی بووە.

گۆڤیندا وتی: ئەمڕۆ لەسەر لێوو زمانی خۆیەوە قسەو ئامۆژگاریەکانی دەبیستین.

سیدهارتا، هیچ وەڵامێکی نەدایەوە، ئەوەندە عەوداڵی فێربوونی پەندو ئامۆژگاریەکانی نەبوو، چونکە خۆی دەیزانی شتێکی تازە بۆ ئەو دەستەبەر ناکەن، ئەویش هەروەکو گۆڤیندا، لەکەسی دووهەمو سێهەمەوە چۆڕاوگی ڕۆحی پەندو ئامۆژگاریەکانی بودای بیستبوو، بەڵام گۆڤیندا بەردەوامو بەوردی سەرسام بوو، بەشانو شەوکەتو پێو دەستە ئاوێزانو بێجوڵەکانی بودا، پێیوابوو لەهەر جومگەیەکی

پەنجەکانیدا حیکمەتو زانیاریەک پەنهانە، کە دەنگێکی مەزنو شەوقێکی ئاشکراو ڕۆشنە.

ئەم پیاوە، ئەم بودا ناوە، بەڕاستی سەرتاپا پیرۆز بوو، سیدهارتا هیچ کاتێکو بۆ هیچ پیاوێک بەو ئەندازەیە ڕێزو حورمەتی دانەنابوو، هەرگیز بەو ئەندازەیەش مرۆڤێکی خۆش نەویستبوو.

هەردووکیان لەشارەوە دوای بودا کەوتنو بەبێدەنگیەکی تەواوەوە لەگەڵیا گەڕانەوە بۆ باغ، بەتەمابوون ئەو ڕۆژە هەردووکیان بەڕۆژوبن، بەڵام کاتێک بینیان گۆتاما خواردنەکەی لەناو بازنەی شوێنکەوتوەکانی خۆیدا دابەشکرد، ئەو پاروەش کە خۆی خستیە دەمییەوە، چۆلەکەیەکیشی تێر نەدەکرد، پاش نان خواردن بەهێمنی لەژێر سێبەری درەختێکی " أنبە"دا بەتەنیاو گۆشەگیر دانیشت.

دەمەو عەسرانێک، کاتێک تینی گەرمای خۆر ڕوو لە ئاوابوون بوو، هەموویان لەو باغەدا ئامادەبوونو بەدەوری یەکترا کۆبوونەوەو گوێیان لەپەندو ئامۆژگاریەکانی بوودا گرت، دوو زاهیدەکەش بەدەنگی بودا ئاشنابوون، دەنگێکی کامڵو ئاراموو پڕ لەشادی، ئەو ئێوارەیە گۆتاما لەبارەی ڕەنجکێشانەوە قسەی دەکرد، باسی ڕەگوڕیشەکانی ڕەنجکێشانی دەکرد، هەزاران جۆر ڕەنجو ئازاری دەستنیشاندەکرد، جگە لە ئازار بەهیچ شێوەیەکیتر تەماشای ژیانی نەدەکرد، جیهانی پڕ لەئازارو ڕەنجو مەینەت دەبینی، بەڵام خۆی ڕێگایەکی دۆزیبووەوە بۆ ڕزگاربوون لەڕەنجو ئازار، ئەو کەسانەش کە ئەم نهێنیەیان دەزانی، قوتار بوو بوونو بەڕزگاری خۆیان گەشتبوون.

ئەو پیاوە مەزنو ناسراوە، بەدەنگێکی نەرمو پایەدار، پەندو





ئامۆژگاریەکانی دەوتەوە، باسی چوار بنەمای گرنگو گەورەی دەکردو ڕێگا "هەشتەوانە"کانی ئاشکرادەکرد، لەوپەڕی حەوسەڵەو خۆڕاگریەوە وانەکانی دەوتەوەو بەهێنانەوەی بەڵگەو نمونەو دووبارەکردنەوەی مەبەستەکانی، قسەی لەگرفتەکان دەکرد، لەکۆتایی ڕۆشناییەوە دەنگی دەگەشتە گوێی بیسەرانی.

کاتێک بودا پەندو ئامۆژگاریەکانی تەواوکرد، شەوداهاتبوو. زیارەتکارێکی زۆر لێی نزیک ببوونەوەو داوایاندەکرد بچنە ڕیزی ئەو کەسانەوە کە شوێنکەوتووی ئەون، بوداش هەموویانی قەبوڵکردو پێیوتن "ئێوە باش گوێتان لەو حیکمەتانە گرت، کەواتە پەیوەست بن بە ئێمەوەو ڕێگای خۆشبەختی تاقیبکەنەوەو ئەزموونی بکەنو کۆتایی بێنن بەڕەنجو ئازارەکان".

گۆڤیندای پەنهانیش هەنگاوێک چووە پێشەوەو وتی: منیش دەمەوێ پەندو ئامۆژگاریو حیکمەتەکانت وەرگرمو پەیمانی دۆستایەتیت لەگەڵدا ببەستم. خۆشحاڵی خۆیشی دەربڕی بۆئەوەی لەڕیزی شوێنکەوتوانیدا وەربگیرێتو پەسەندبکرێت، پاشان پەسەند کراو لەڕیزی ئەواندا وەرگیرا.

بودا بۆ پشووی شەوانەی خۆی، کۆمەڵی شوێنکەوتووانی جێهێشت، گۆڤیندا ڕوویکردە سیدهارتاو وتی: ئەی سیدهارتا، من ناتوانم سەرزەنشتی تۆ بکەم، ئێمە هەردووکمان گوێمان لەپەندو ئامۆژگاریو حیکمەتەکانی ئەم پیاوە ناودارو مەزنەگرتو گوێبیستی حیکمەتەکانی بووین، گۆڤیندا کەگوێی لەو حیکمەتانە گرت قەبوڵی کردن، بەڵام ئەی دۆستیئازیزم، ئایا ناتەوێ ڕێگای قوتاربوونو ڕزگاری هەڵبژێری؟ دەتەوێ دووبارە لەسەبرو چاوەڕوانیدا

بمێنیتەوە؟

سیدهارتا کاتێ گوێی لەو قسانەی گۆڤیندا بوو، وەک کەسێک لەخەوێکی قوڵ ڕاپەڕێت، بەخۆیدا هاتەوەو ماوەیەکی زۆر تەماشای ڕوخساری گۆڤیندای کردو پاشان بەهێمنیو بەبێئەوەی هیچ گاڵتەکردنێک لەقسەکانیدا دەرکەوێت، وتی: ئەی گۆڤیندا... ئەی دۆستی من، تۆ دەستت کردوە بەتەیکردنی سەرەتای ڕێگایەکی تازەو ڕێگای خۆتت هەڵبژاردووە، ئەی گۆڤیندا، تۆ دۆستی من بوویتو وابەستەبووی بە منەوەو هەمیشە هەنگاوێک لەپشتمەوە ڕادەوەستای، زۆر کات لەخۆمم دەپرسی: تۆ بڵێی گۆڤیندا بتوانێت هەرگیز بەبێ من، بەئیرادەو عەقڵی خۆی هەنگاوێک بنێ؟ بەڵام ئێستا وا پیاوێکیتو ڕێگای خۆتت هەڵبژاردووە، ئەی دۆستیمن، ئومێدەوارم ئەم ڕێگایە تەواوکەیتو بگەیتە ڕزگاریو دوا مەرامی خۆت.

هێشتا گۆڤیندا بەباشی لەم قسانە تێنەگەشتبوو، بە نائارامیەکەوە پرسیارەکەی دووبارە کردەوەو وتی: ئەی دۆستی ئازیز، پێمبڵێ.... پێمبڵێ، تۆ هێشتا کارێکی ترت دەستپێنەکردوە، تۆش دەکەویتەوە کەڵکەڵەی سوێندو پەیمانی دۆستایەتی لەگەڵ بودا دا.

سیدهارتا دەستی خستە سەرشانی گۆڤینداو وتی: گۆڤیندا تۆ دوعاکەی منت بیست، جارێکیتر دووبارەی دەکەمەوە، ئومێدەوارم ئەم ڕێگایە تەواوکەیتو بگەیتە ڕزگاریو مەرامی خۆت.

چیتر گۆڤیندا تێگەیشت کەوا دۆستەکەی بەجێیدێڵێ، ئینجا دەستیکرد بەگریان... بەدەنگی بەرز هاواری کرد "سیدهارتا".

سیدهارتا بە میهرو دڵخۆشیەکەوە پێیوت: گۆڤیندا... بیرت نەچێ کە ئێستا تۆ لە ریزو گروپی پیاوە پیرۆزەکانی بودایت، تۆ، ماڵ، دایکو





باوک، سەروەتو سامان، نەسەبو بنەچە، ئیرادەو دۆستایەتیت جێهێشتوەو دوور فرێدراوی، ئەمەش ئەو نهێنیەیە لەناو ئەو حیکمەتو پەندو ئامۆژگاریانەدا پەنهان بوو کە تۆ گوێت لێگرتن، ئەمە ئیرادەی ئەو ناودارە مەزنەیە، ئەو شتەیە کە تۆ خۆت خوازیاری بووی.. ئەی گۆڤیندا.. من سبەی بەیانی ماڵئاوایت لێدەکەمو لەتۆش... جیادەبمەوە.

ئەم دوو دۆستە ماوەیەکی زۆر بەناو درەختەکاندا گەڕانو هاتوچۆیان کرد، پاشان بۆ حەوانەوە سەریان نا بەزەویەوە، بەڵام خەو نەچووە چاویان، گۆڤیندا هێشتا وابەستەبوو بە دۆستەکەیەوە، هەوڵیدا بیخاتە ژێر فشارو پرسیارەوە، بۆئەوەی بزانێت، بۆچی ئەویش باوەڕ ناهێنێت بەبوداو ناچێتە ڕیزی شوێنکەوتوانیەوە؟ بۆچی لەڕۆحی قسەکانی بودا تێنەگەشتووە؟ چ عەیبێکی لەو قسانەی بینیوە؟.

سیدهارتا، ئارامی دەکردەوەو دەیوت: گۆڤیندا ئارام بە، ئەو پیاوە ناودارو مەزنە، پەندو ئامۆژگاریەکانی زۆر بەنرخو گەورەن، من چۆن دەتوانم نوقسانیو عەیبو عاریان تێدا بدۆزمەوە.

بەیانی زوو یەکێک لەموریدە بەساڵاچووەکانی بودا هاتە باخەکە بۆ لایان، دەیویست بانگیان بکاتو خێرا جبەی زەردیان پێ لەبەرکات، چونکە تازە بەڵێنی دۆستایەتیان داوە بەبوداو سوێندی وەفادارییان بۆ حیکمەتو پەندو ئامۆژگاریەکانی خواردوەو بۆ ئەو بازنە تازەیە یەکەمین ئەرکە سەرەتاییەکانیان فێربکات.

لەو کاتەدا گۆڤیندا کراسەکەی لەبەر خۆیدا داڕاندو دۆستەکەی سەردەمی منداڵیو لاویەتی خۆی ماچ کردو عابای ڕەبەنەکانی پۆشی.

سیدهارتا بەناو درەختەکاندا کەوتەڕێو لەبیرکردنەوەیەکی قوڵدا نوقم بوو، بودای ناودارو مەزنی بینی لەژێر درەختێکدا دانیشتوە، بەوپەڕی حورمەتو ڕێزەوە سڵاوی لێکرد، کە نێوچەوانی بودای بینی پڕە لەشادیو میهرەبانی، بۆیە گوڕو تینێکیدا بەخۆیو لێی نزیککەوتەوەو داوای یارمەتیکرد کە چەند قسەیەک لەگەڵ ئەو حەکیمە تاقانەیەدا بکات، بوودا بەبێدەنگی سەرێکی ڕاوەشاندو بواریدا قسەبکات.

سیدهارتا وتی: ئەی ناوداری تاقانە، دوێنێ تامەزرۆی ئەوەبووم گوێ لەپەندو ئامۆژگاریە مەزنو بەنرخەکانت بگرم، منو دۆستە هاوڕێکەم لەشوێنێکی زۆر دوورەوە هاتوین بۆ ئێرە بۆئەوەی پەندو ئامۆژگاریو حیکمەتەکانی تۆ ببیستین، دۆستەکەم لەبەرامبەر تۆدا سوێندی بەڵێنو دۆستایەتی خواردوەو هاتوەتە ڕیزی شوێنکەوتوانی تۆوە، بەڵام من درێژە بەگەشتەکەم دەدەم.

بودا لە کەماڵی ئەدەبەوە وتی: نزیکی لەخۆتەوە.

سیدهارتا دووبارە وتی : پێدەچێت لای تۆ قسەکانم بێباکانە بکەونەوە، بەڵام داوای لێبوردن دەکەم، چونکە نامەوێ بەبێ ڕونکردنەوەی بیروبۆچونەکانم ئەم حەکیمە هۆشمەندە جێبهێڵم، ئایا ئەم ناودارە مەزنە دەتوانێت کەمێک زیاتر گوێ لە قسەکانم بگرێت؟

دووبارە بودا سەرێکی ڕاوەشاندو ڕەزامەندی خۆی دەربڕی، سیدهارتا وتی: ئەی ناوداری مەزن، لەناوهەموو حیکمەتەکانی تۆدا یەک شت هەیە کە لە هەموویان بەجوانترم زانیوەو پەسەندم کردووە، لای تۆ هەموو شتێک بە تەواوی ڕوونو ئاشکرایە، تۆ جیهانت پێناسەکرد وەک زنجیرەیەکی دانەبڕاوو کامڵو ئەبەدی، ئەڵقەکانی





وەک "عیلەتو مەعلول" پێکەوە گرێدراون، ئەم مەبەستە، هەرگیز وا بەباشیو بەو ڕونیە پێناسە نەکراوە، بەڕاستی ئەو براهمای کە لە پەنجەرەی حیکمەتەکانی تۆوە سەیری جیهان دەکات، دەبێت دڵی ڕاچڵەکێت، چونکە تەماشادەکەیت گەردون ئەوەندە وابەستەیە بەیەکەوە هیچ گرفتو درزێکی تێدا نابینرێت، وەک شوشەیەکی سافو بێگەرد وایە کە پاڵپشتێکی نیە بۆ ڕێکەوت، چیتر مەرامێکت بەخوداکان نامێنێ.

چاکە یان خراپەی جیهان، چێژ یان مەینەتە شەخسیەکانی ژیان، حەقیقەت یان گریمانەی ئەم جۆرە حاڵەتانە، هیچکامیان ئەوەندە گرنگ نین، بەڵام یەکێتی جیهانو پەیوەندی ڕووداوەکان، بچوکو گەورەیان تێکڕا لەباوەشی یەک ڕوباردا نیشتەجێن، ئەمانە هەموویان لە ژێر یەک ڕازو نهێنی " عیلەتو مەعلول"دانو دەبێت لەدایک بنو بمرن، دەتوانین ئەمانە هەموویان لە حیکمەتەکانی تۆدا ببینین، بەڵام بەپێی قسەکانی تۆ، ئەو یەکێتی بوونەو ئەو گرنگیە لۆژیکیە لەشوێنێکدا دەشکێت، لەو درزە بچوکەشەوە کە دەکەوێتە جیهانی یەکبونەوە، شتێکی سەیر دەکەوێتە جوڵەوە، شتێکی تازە کە پێشتر لەوشوێنەدا نەبووە، شتێک کە هەرگیز نمایش ناکرێتو ناسەلمێنرێت، بنەمای حیکمەتەکانی تۆش ئەمەیە، کە دەبێت لە ئاستی جیهان باڵاتر بڕۆیتو ڕزگاربی، بەو درزە بچوکەو لەو شکاندنە لاوەکیەوە بەیەکجاری نهێنی جاویدانو یەکێتی جیهان تێکدەشکێت.

بەڵام ئەگەر بەشێوەیەکی جیاوازو ناکۆک باسی ئەم تیۆرەم کردوە، ئەوا لێمببورە.

گۆتاما بێجوڵە دانیشتبوو بەبێدەنگی گوێی لێگرتبوو، پاشان ئەو

پیاوە تاقانەو کامڵە بە دەنگێکی میهرەبانو ڕێکوپێکو ڕۆشن هاتە قسەو وتی: ئەی کوڕی براهما... زۆر باش گوێت لە قسەکانمان گرتووە، بەڵام تۆ هیچ کەموکوڕیو عەیبێکت لەوقسانە دیوە، لەکاتێکدا بە ئەندازەیەکی زۆر بیرکردنەوەی جوانو بەنرخو قوڵن، بۆیە جارێکیتر لەو بارەوە بیربکەرەوە، ئەی ئەو پیاوەی تینوی فێربونو وەرگرتنی حیکمەتەکانی، دەرفەتم بەرێ با لەبێشەلانی بیروباوەڕو جەنگی وشەکان دەربازتکەم، بیروباوەڕەکان هیچ مانایەکی ئەوتۆیان تێدا نیە، لەوانەیە جوانبن یان ناشیرین، جاهیلانەبن یان هۆشمەندانە، هەموو کەس دەتوانێ وەریانگرێت، یاخود فرێیانبدات، بەڵام ئەو پەندو ئامۆژگاریانەی کە تۆ گوێبیستیان بووی، بیروباوەڕی من نین، چونکە ئامانجی ئەو پەندو ئامۆژگاریانە لای گەڕیدەکانی حیکمەت پێناسەکردنی جیهان نیە، بەڵکو ئامانجی ئەوانە، دروست شتێکی ترە، دەبێ ئەو شتەش قوتاربوونو ڕزگاربوون بێت لە ڕەنجو ئازار، ئەو حیکمەتو زانیاریەش کە گۆتاما دەیبەخشێت، بەتەنها ئەمەیەو هیچ شتێکیتر نیە.

سیدهارتا وتی: ئەی هۆشمەندی سەرفراز، ئەوەندە ڕق ئەستور مەبە لەگەڵما، کە بەم جۆرەش قسەم کرد، مەبەستم نەبوو بکەومە ناو جەنگی وشەکانەوە، بە تەواوی ڕاست دەکەیت کە بیروباوەڕەکان نابنە خاوەنی بەهایەک، بەڵام یارمەتیم بدە زیاتر قسەبکەم، من تەنانەت بۆ چرکەیەکیش گومانم لەتۆ نیەو تەنانەت گومانێکم لەو ڕێگەیەت نیە کە تۆ بودایتو گەشتوی بەو ئامانجە زۆر مەزنەی کە هەزاران براهماو براهمازادە خوازیارن پێیبگەن، تۆ بەو گەڕانە بەدوای خۆتدا، بەو ڕێگاو ئەندێشەو بیرکردنەوەیە ، بەو هۆشمەندیو





حیکمەتە، توانیوتە بەئامانجی خۆت بگەیت، ئەی حەکیمی مەزن، بوارم بدە، بۆئەوەی پێتبڵێم.. تۆ لە ڕێگای پەندو ئامۆژگاریەوە شتێکی ئەوتۆت بەدەست نەهێناوە، هیچ کەسیش لەو ڕێگایەوە ڕزگاریی بەدەست ناهێنێت، ئەی پیاوی مەزن، تۆ ئەو حاڵەتەی کە لە ئەزموونکردنو چرکەساتی گەیشتن بە ئامانجو ڕۆشنبونەوەی هزردا بەسەرت هاتووە، ناتوانیت لە چوارچێوەی وشەکاندا بە کەسی تری بڵێیتەوە، ئامۆژگاریەکانی بودای مەزن شتگەلێکی زۆریان لە خۆگرتوە، دورکەوتنەوە لە خراپەکاریو ژیانێکی خواپەرستانەمان فێردەکەن، بەڵام خاڵێک دەمێنێتەوە، ئەویش زۆر ڕونو ئاشکرایە، پەندو ئامۆژگاریە مەزنەکانی تۆ ئەو خاڵەیان تێدا نیە، ئەی ناوداری بەنرخ، ئەی ئەو پیاوەی لە ناو سەدان هەزار کەسدا جیاوازو بەهادارو تاقانەی، ئەو گەڕانو ئەزمونەی کە تۆ خۆت تێتپەڕاندوە، لەپەندو ئامۆژگاریەکانتا نابینرێت، ئەمە ئەو شتە بوو کە من لە قسەکانی تۆدا بیستمو تێگەیشتم، هەر لەبەرئەمەشە بە ڕێگایەکی تردا دەڕۆم، نەک لەبەرئەوە بەدوای بیروباوەڕی ترو بنەمای باشتردا بگەڕێم، نەخێر، چونکە دەزانم شتێکی وام دەستناکەوێت، دەڕۆم بۆئەوەی واز لە هەموو بنەماو بیروباوەڕو مامۆستاکان بهێنمو خۆم بە تەنها، یان بگەمە ئامانجێک یان بمرم.

بەڵام ئەی بودای بەنرخ، ئەم ڕۆژو سەعاتانە هەمیشە لە خەیاڵمدا دەمێننەوە، هەرگیز ئەوەم لەیادناچێت کاتێ چاوەکانم تەماشایان دەکردی، چەند پیاوێکی پیرۆزبویت.

بوودا چاوەکانی داخستبوو، تەماشای خوارەوەی دەکرد، لە ڕووخسارە قوڵەکەیدا ویقاری بەتەواوی دەرکەوتبوو، سومبولی

مەزنی ئەو بوو، پاشان بودای حەکیم سەری بەرزکردەوەو وتی: هیوادارم هەڵەت نەکردبێ لەبەڵگەکانی خۆتدا، ئومێدەوارم بە ئامانجی خۆت بگەیت، بەڵام تۆ تێکەڵیو پێکەوەبوونو دۆستایەتی پیاوە پیرۆزەکانی منت بینیوە؟ ئایا ئەو برایانەی منت بینیوە کە سوێندی بەڵێنو وەفادارییان بە پەندو ئامۆژگاریەکانی ئێمە خواردووە؟

ئەی ئەو زاهیدەی لە ڕێگا دورەکانەوە هاتویت، ئایا بەبڕوای تۆ باشتروایە هەموو ئەو کەسانە پەندو ئامۆژگاریەکانمان فڕێبدەنو سەرقاڵی ئارەزوەکانیان بنو بە ژیانی دنیاییەوە خەریک بن؟

سیدهارتا وتی: هیچ کات لەم بارەوە بیرم نەکردوەتەوە، لەوانەیە ئەو کەسانە بە پەیڕەویکردنی پەندو ئامۆژگاریەکانی تۆ بگەنە ئامانج، داوەریکردنی ژیانی ئەوانیتر کاری من نیە، من تەنها دەتوانم داوەری کردەوەکانی خۆم بم.

من تەنها پێویستە بۆ خۆم شتێک هەڵبژێرم، یان شتێک بخەمە لاوە، ئێمەی زاهید خوازیارین لە کۆتو بەندی نەفس ڕزگارمان بێت، ئەگەر من ببم بە یەکێک لە پەیڕەوکارو شوێن کەوتوانی تۆ، بە داوای لێبوردنەوە دەبێت بڵێم، ئەوکاتە پەیمانی دۆستایەتی من لەگەڵ تۆدا زۆر ڕوکەشانە دەبێتو خۆم فریودەدەم ئەگەر وابزانم چومەتە ڕیزی پاکیزەکارانەوەو ڕزگاریم بەدەست هێناوە، چونکە دەرونو ناخی من بەڕاستی پەرەی بە گەشەو ژیانی خۆی داوە، بەڵام بەشێوەی وانەو زانیاریەکانی تۆ، بەشێوەی پەیمانی دۆستایەتی من لەگەڵ تۆداو عەشقی من بۆ تۆو بۆ ئەو کۆمەڵە کەسانەی کە منیان لەناو خۆیاندا قەبوڵکردووە، خۆی نمایش دەکات.

بودا بە نیوە زەردەخەنەیەکەوە لەکەماڵی خۆڕاگریو ڕۆشناییو





ڕاستگۆییدا تەماشای کردو بە ئاماژە کردنی دەستی ئەو پیاوە نامۆیەی ئازاد کردو وتی: ئەی سامانا تۆ زۆر زیرەکی، ئەی دۆست، ئەزانی چۆن زیرەکانە قسەبکەی، بەڵام وریایی لەو هەموو زیرەکیە.

بودا هەستایە سەرپێو بەجێیهێشت، بەڵام نیگاو نیمچە زەردەخەنەکەی بۆ هەتاهەتایە لە یادەوەری سیدهارتادا نەخشێنرا، بیری لەوەکردەوە.. چیتر من هەرگیز پیاوێک نابینم وا بەوجۆرە نیگاو زەردەخەنە بکاتو بەوشێوەیە دانیشێت، دەمەوێ منیش ئاوا بەوشێوەبم، بەوجۆرە زەردەخەنە بکەمو بەو جۆرەش دانیشم، ئەوەندە ئازاد، بێ کۆتو بەند، ساف، ڕەمزئامێز، مناڵکارو سادەبم، لەکاتێکا کەسێک دەتوانێت بەو شێوەیە دەرکەوێت، یان بەو شێوەیە بڕوات بەڕێوە کە خۆی ڕام کردبێت، منیش خۆم ڕام دەکەم، تەنها یەک کەس، یەک پیاوم دیوە لە بەرامبەریا چاوەکانم دابخەم، چیتر من لە بەرامبەر هیچ مرۆڤێکدا چاوەکانم داناخەم، چونکە پەندو ئامۆژگاریەکانی سەرنجیان ڕانەکێشام، ئیتر قسەکردنی هیچ مامۆستایەک سەرنجی من ڕاناکێشێت.

سیدهارتا لەدنیای خەیاڵو بیرکردنەوەدا بەخۆی دەوت: بودا شتێکی لەمن سەندوە... ئەو شتێکی لە من سەندوە، بەڵام لەباتی ئەوە شتێکی پڕ بەهاتری داومەتەوە، بوودا گۆڤیندای دۆستمی لێسەندوم، ئەو دۆستەی کە هەمیشە باوەڕی بەمن هەبوو، بەڵام ئێستا باوەڕی بەو هەیە، گۆڤیندا سێبەری من بوو، ئەوەتا ئێستا بووەتە سێبەری گۆتاما، بەڵام لەباتی گۆڤیندا، سیدهارتای داومەتەوە، واتا خۆمی داومەتەوە.

***

# بێداری

سیدهارتا، ئەو باغەی بەجێهێشت کە نشینگەی بوودای مەزن بوو، ئەو شوێنەی کە گۆڤیندا تێیدا باوەڕی بە بودا هێنابوو، سیدهارتا خۆشی هەستی بەوەکرد کە چیتر دەستبەرداری ژیانی پێشووتری بووەو لەو باغەدا ژیانی ڕابردووی خۆی فەرامۆشکردووە، بەوجۆرە ملی ڕێگای گرتەبەر، تا ئەو شوێنە نوقمی دنیای بیرکردنەوە بوو کە هەستەکان توشی نەگبەتیان کردبوو، تاگەیشتە ئەو ئاستەی بتوانێت لە (عیلەت)ەکان تێبگاتو باوەڕی وابوو، بۆ ئەوەی لە عیلەتەکان تێبگەین پێویستە بیربکەینەوە، چونکە تەنها لە ڕێگای بیرکردنەوەوە بەڵگەکان بوونەتە بەرگی زانستو پارێزگارییان لێدەکرێتو وەک خاوەن حەقیقەتێک گەشەدەکەن.

سیدهارتا بە ڕێگای خۆیدا دەڕۆیشتو لەبیرکردنەوەیەکی قوڵدابوو، سەیری خۆی کردوو تێگەیشت، چیتر بووە بە پیاوێکو لە قۆناغی لاوی تیپەڕیوە، سەیریکردو هەستی بەوەکرد شتێک ئەوی بەجێهێشتوە، وەک چۆن مارێک لە دورەوە کاژەکەی خۆی دەخات، ئاوا شتێکی لێبەجێماوە، هەرگیز لەگەڵ شتێکیتردا ئەوەندە زۆر نەماوەتەوە، شتێک، بەدرێژایی دەورانی منداڵیو سەردەمی لاوێتی لەگەڵیا ژیاوە، هەمیشە پارچەیەک بوو لە جەستەی، بەڵام ئەوەی وایکرد دەستبەرداری بێت، لەلایەکەوە ئەو شەوقو ئارەزووە بوو کە مامۆستاکەی هەیبو، لەلایەکی ترەوە گوێگرتنی گۆڤیندا خۆشی لە پەندو ئامۆژگاریەکانی مامۆستا.





سیدهارتا وازی لە دواهەمین مامۆستاو گەورەترینو حەکیمترین کەسایەتی ناو ئەوانەش هێنا کە بودای پیرۆزبوو، ناچاربوو ئەویش جێبهێڵێت، چونکە نەیدەتوانی باوەڕ بە پەندو ئامۆژگاریەکانی بکات.

ئەو پیاوە هۆشمەندە بەهێمنی بە ڕێگادا دەڕۆشتو لەخۆی دەپرسی: باشە تۆ بەدوای ئەو پەندو ئامۆژگاریانەدا وێڵو عەودالّی چیبوویت؟ چیت لە مامۆستاکەت دەویست؟ سەربارى ئەوەی برێکی زۆر شتیان فێرکردی، بەڵام ئەو شتە چیبوو کە نەیانتوانی فێرت بکەن؟ سیدرهارتا لەم بارەیەوە بیرکردنەوەیەکی قوڵ بردیەوە، پاشان بەخۆی وت: ئا.. ئەوەی کە تامەزرۆو خوازیاری چۆنیەتی ناسینی بووم نەفس بوو، من ویستم لە داوی نەفس خۆم ڕزگارکەمو دەستەمۆی بکەم، بەڵام لێزانو بەهرەمەند نەبووم لە چۆنیەتی دەستەمۆکردنیدا، تەنها توانیم فریوی بدەمو لێیهەڵێم، تەنها توانیم پەردەپۆشی بکەم، بەڕاستی هیچ شتێک لەم دنیایەدا بەم ئەندازەیە بیرو بۆچونی منی بەخۆیەوە سەرقاڵ نەکردووە، لەم مەتەڵە سەرم دەرنەکرد کە چۆن "من"یش ژیان دەبەمەسەرو "من"ی تەنیا کەوتوو لەگەڵ هەموو ئەوانیتردا ناکۆکو جیاوازم، کەچی "من" دەبمە سیدهارتا. هەروەها لەبارەی سیدهارتاوە هیچ شتێک نازانم، تەنانەت لەم جیهانەدا دەربارەی هەر شتێکیتر بەم ئەندازەیەی خۆم بێئاگانیم، ئەم پیاوە هۆشمەندە بە ڕێگای خۆیدا دەڕۆیشت، لە پڕ بێدەنگ بوو،و وەستا، بیرکردنەوەکانی لە ژێر کۆنترۆڵی خۆیدا دەریانهێنابوو، لەهەر بیرکردنەوەیەکدا، بیرکردنەوەیەکی دیکە سەرچاوەی دەگرت، لەو هۆکارە تێگەیشت کە بۆچی لە گەڕانەوەیدا بۆ خودی خۆی، بۆ لای سیدهارتای ناخی خۆی شتێکی نەدەزانی، بۆچی لای خۆشی سیدهارتا نامۆو نەناسراو بوو، زانی هۆکارەکەی تەنها یەک شتە،

ئەویش دەشێ ترسی سیدھارتا بێت لەخۆی، دەیوت: من لەخۆم ھەڵھاتووم، من خوازیاری براھماو ئاتمان بووم، من لە پێناوی ئازادبوون لە خۆم، لە پێناوی دەرونێکی پەنھان، لەپێناوی بوون‌و کرۆک‌و ریشەی ھەموو شتێک، لە پێناوی گەشتن بە ئاتمان بە ژیان‌و بە خودایەکی ڕەھا، دەمویست خۆم لەناوبەرم.

سیدھارتا بۆ سەرەوەو بەچوار دەوری خۆیدا تەماشایکرد، زەردەخەنەیەک ڕوخساری ڕۆشنکردەوەو ھەستێکی ڕاچڵەکێنەر وەک ھەستی بە ئاگاھاتن لە خەوێکی قوڵدا سەرتاپا بوونی داگیرکرد، دیسان ملی ڕێگای گرتەبەر، بەڵام ئەمجارەیان بە پەلە ڕێگای دەبڕی‌و وەک کەسێک کە بزانێت بۆ کوێ دەچێت، لەوکاتەدا ھەناسەیەکی قوڵی ھەڵکێشاو بەخۆی وت: من چیتر یاخی نابم لە سیدھارتا، چیتر بیرکردنەوەکانم سەرقاڵ ناکەم بە ئاتمان‌و مەینەت‌و زەحمەتەکانی دنیا، خۆم پارچە پارچە ناکەم‌و خۆم لەناو نابەم، تاوەکو لە نێوان پارچەکانی جگەردا حیکایەتێکی شاراوە بدۆزمەوە، چیتر لەمە زیاتر "یوگاڤیدا"و "ئاتھارڤاڤیدا" یان خەڵوەتکێشان‌و پەندو ئامۆژگارییەکان ناخوێنمەوەو دوایان ناکەوم، لە خۆمەوە دەست دەکەم بە فێربون‌و دەبمە قوتابی خۆم، من نھێنی‌و حیکایەتی سیدھارتا لە خودی سیدھارتا خۆیەوە وەردەگرم.

سەیری چواردەوری خۆیکردو واھەستیکرد یەکەمجارە جیھان دەبینێت، دنیا جوان‌و سەرنجڕاکێش، و پڕ لە نھێنی خۆی دەنواند، شوێنێک شین‌و شوێنێ زەردو شوێنێ ڕەنگی سەوزبوو، ئاسمان‌و ڕووبار، شاخ‌و دارستان، ھەموویان جوان بوون، ھەموویان پڕ نھێنی‌و سیحراوی دەھاتنە پێشچاو، سیدھارتا ھەر ئەوەندە کە بەئاگا ھاتبوەوە، لەناو ئەو ھەموو شتانەدا بە ڕێگای خودناسیدا دەڕۆیشت،





ھەموو ئەو شتانە، ھەموو ئەو ڕەنگە زەردو شینانە، دارستان‌و ڕووبارەکان، ھەموویان بۆ یەکەمجار بە بەرچاویدا تێپەڕین، چیتر ئەمانە بێمانا نەبوون، جادوی "مارا"و چادری "مایا" نەبوون ، زادەی ڕێکەوتە جۆر بەجۆرەکانی شێوازی ڕواڵەتی دنیا نەبوون، بەوجۆرەی کە براھما گەورەکان وەک دوژمنێک تەماشایان کردون‌و بە سەرچاوەی نەفرەتیان زانیون‌و تەنھا خوازیاری وەحدانیەت بوون.

ڕووبار، ھەر ڕووبارەو ئەو خودا تاقانەیەش کە لە ویژدانی سیدھارتادا نیشتەجێیە لە شینایی ڕووباریشدا بەپەنھانی بوونی ھەیە، کەواتە ئەوەی کە لە ڕەنگی شین‌و زەردو ئاسمان‌و دارستان‌و سیدھارتادا وەک بوونێک دەرکەوت، مەیل‌و ئیرادەیەکی ئیلاھی‌بوو، ھیچ کاتێک ماناکان‌و حەقیقەتەکان لە شوێنێکداو لەودیوی شتێکەوە شاراوەو پەنھان نەبوون، بەڵکو ھەمیشە لەناو شتەکاندا بوونیان ھەیەو ھیچ شتێکیش خاڵی نیە لەو ماناو حەقیقەتانە.

سیدھارتا لە کاتێکا بە پەلە دەڕۆیشت‌و بە خۆی وت: چەند کەرو گەمژە بووم، ئەگەر کەسێک تامەزرۆی خوێندنەوەی شتێک بێت‌و بیەوێت بیخوێنێتەوە، نابێت جەنگ‌و ململانێی ھەبێت لەگەڵ وشەکان‌و خاڵەکاندا، نابێت بە وەھم‌و ڕێکەوت‌و فریودەریان بزانێت، یان بێبەھا وەکو سەدەفەکان، بەڵکو دەبێت ھەموو ئەو شتانە بخوێنێتەوەو وشە بە وشە ئارەزوومەندانە بیانخاتە بەردەم خوێندنەوەوە.

من دەمویست کتێبی کۆنە ساڵی جیھان‌و کتێبی پڕ نھێنی سروشت بخوێنمەوە ، بەڵام ھەر لەیەکەم وشەو یەکەم خاڵ‌و نیشانەوە دوژمنم بوون، گەردونم وەک ڕوکەشێکی فریودەرانە خوێندەوە، تەنانەت پەیبردنەکانی زمان‌و چاوەکانی خۆشمم بە زادەی ڕێکەوت دەزانین، نەخێر، چیتر ئەو قۆناغە کۆتایی ھاتووە، من بەئاگا ھاتووم، بەڵێ...

بەڕاستی بەئاگا بوومەتەوەو لەمڕۆوە تازە هاتومەتە دنیاوە".

کاتێک ئەم جۆرە بیرکردنەوە لە خەیاڵدانی سیدهارتادا تێپەڕی، لەناکاو لەجێگەی خۆی وەستا، وەک کەسێک مارێکی لەسەرە ڕێدا دیبێت، پاشان تەواو بەڕوونی تێگەیشت لەوەی تازە بەئاگا هاتووەتەوەو تازە لە دایک بووەو پێویستە سەر لەنوێ ژیان دەستپێبکاتەوە.

کاتێک لەگەڵ کازیوەدا باغی "جیتاوانا"و بودای مەزنی بەجێهێشت، لە بەئاگا هاتنەوەیەکی تەواوداو لە ڕێی خۆ دۆزینەوەدا بوو، چیتر بە نیازی ئەوە بوو پاش چەند ساڵێک خەڵوەتکێشان بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوەو بچێتەوە لای باوکی، زۆر سادە ئەم حاڵەتەشی وەردەگرت، بەڵام لەوشوێنەدا لە حاڵەتی بێدەنگیدا وەستابوو، وەک ئەوەی مارێکی لەسەر ڕێدا بەدیکردبێت، ئەم خەیاڵە سەریهەڵدا "چیتر من ئەو کەسەنیم کە پێشتر هەبووم، ئیتر زاهیدنیمو نابمە کاهین یان براهما، ئەی ئەگەر بگەڕێمە ماڵەوە دەبێت چیبکەم؟ وانە بخوێنم؟ قوربانی پێشکەش بکەم؟ بیربکەمەوە؟ چیتر لای من ئەم شتانەش کۆتاییان هاتووە".

سیدهارتا بێجوڵە وەستا، سەرمایەکی توند سەراپا جەستەی داگیرکرد، وەک چۆن باڵندەیەک، کەروێشکێک، یان ئاژەڵێکی بچوک، هەست بە تەنیایی بکات، ئاوا لە ناخەوە کەوتە لەرزین.

ئەو ساڵەهای ساڵ بێخانم بوو، بەڵام هەستی بەو ئازارە نەدەکرد، ئەوەی ئەو پێشتر هەستی پێدەکرد، تەنانەت لە حاڵەتی قوڵترین بیرکردنەوەکانیدا، کوڕی باوکی خۆی بوو، براهماو پیاوێکی مەزهەبی بوو، بەڵام ئەوەتانێ ئەو تەنها سیدهارتا بوو. سیدهارتایەک کە بەئاگاو چاوەکانی کرابونەوە، قوڵ هەناسەی دەداو بۆ





ساتەوەختێکیش هاتبوە لەرزین، هیچ کەسێک وەک ئەو تەنیا نەبوو، چیتر سیدهارتا نەجیبزادەیەک نەبوو کە پەیوەندی بەچینی خانەدانەکانەوە هەبێت، پیشەکارێک نەبوو کە پەیوەست بێت بە پیشەکەیەوەو پەنای بۆ بەرێتو بەشدارییکات لە ژیانو ڕێورەسمی هاوپیشەکانی خۆیدا، براهما نەبوو تاوەکو تەمەنی لەگەڵ براهماکاندا بەسەربەرێت، خەڵوەتکێش نەبوو کە پەیوەست بێت بە "سامانا"کانەوە، تەنانەت گۆشەگیرترین ئەو کاهینانەی کە نیشتەجێبوون لە دارستاندا، تاکو تەنیا نەبوون، هەریەکەیان پەیوەندیدار بوو بە ڕیزی هەزاران برای کاهینی خۆیەوە، گۆڤیندا لە ڕیزی ڕەبەنەکاندا خۆی بینیەوەو بوو بە یەکێک لەو هەزارەها ڕەبەنە، جلی ڕەبەنەکانی کردبووە بەریو وەک ئەوان باوەڕی هەبوو، بەزمانی ئەوانیش قسەیدەکرد، بەڵام سیدهارتا، پەیوەندی بە کوێوە هەبوو؟ ئەیتوانی لە ژیانی چ کەسێکدا بەشداری بکات؟ ئەیتوانی بەزمانی چ کەسێک قسەبکات؟ لەوکاتەدا، کە جیهانو ئەوانەی چواردەوری یەک بەیەک لەناودەچون، لەو چرکەساتەدا وەک خۆرێک لە ئاسماندا بە تەنیا وەستابوو، لەتاو سەرمای بێزاری، هیلاکو شکست خواردوو بووبوو، ئەوکاتە پایەدارتر لە هەرکاتێکی تر سیدهارتا خۆی بوو، ئەوە دواهەمین لەرزینی بێداریو دواهەمین ئازاری لەدایک بوون بوو، بەپەلەو بێ مەبەست دەستی بە ڕۆشتن کرد، چیتر بەرەو مەنزڵی خۆی نەڕۆشت، چیتر نەگەڕایەوە بۆ لای باوکیو ئاوڕی لە دوای خۆی نەدایەوە .

***

# کەمالە

سیدهارتا لەو ڕێگایەدا لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا شتێکی تازە فێر دەبوو، چیتر دنیای ئەو گۆڕابوو، خۆشی پابەندو گرفتار بوو بوو، . ئەو خۆری بینی لەسەر لوتکەی شاخو بەرزایی دارستانەوە هەڵهاتو لەو دیو دارخورما دووردەستەکانی دەریاوە ئاوابوو، ئەستێرەکانو مانگی لە شێوەی دەمەداسێکدا بینی کاتێ شەوانە لە دەریای شینی ئاسماندا نوقمی مەلەکردنن، درەختەکان، ئەستێرەکان، ڕۆح لەبەرەکان، هەورەکان، پەلکەزێڕینە، بەردەکان، گوڵەکان، گژوگیاکان، جۆگەلەو ڕووبارەکان، بروسکەی شەونمی بەیانیەکی زوو بە ئاسمانی کورتە گژوگیاکاندا، ئەو کێوە دوور دەستانەی کە شینباو دەردەکەوتنو ڕەنگیان پەڕیبوو، نەغمەی باڵندەکان، ویزەویزی هەنگەکانو هەڵکردنی شەماڵێکی دلڕفێن بەسەر کێڵگەکانی برنجدا، بەڵێ ئەو.. ئەو هەموو شتانەی بینی ئەو هەموو شتانەی بیستو هەستیپێکردن، هەموو ئەو شتانە هەمیشە بە ڕەنگی جۆراوجۆر لە هەزاران ڕووخساری جیاجیادا ئامادەبوون، خۆرو مانگ ئەدرەوشانەوە، ڕووبارەکان پێکەوە بەسترابوونو لە جوڵەدا بوون، هەنگەکان بەردەوام ویزە ویزیان دەهات، بەڵام پێشتر ئەمانە لای سیدهارتا جگەلە پەردەیەکی بەسەرچوو لە وەهمو فریو هیچ شتێکی تر نەبوون، کە دەشیا بە گومانەوە لێیان بڕوانیو مەحکومی بکردنایە بە کاڵفامیو دوورەپەرێز بێت لێیان، لەپێناو پاراستنی هزردا، چونکە هەڵگری حەقیقەت نەبوون،





سیدهارتا لەوسەردەمەدا حەقیقەتی بە شتێکی پەنهان دەزانی لە پشتی هەموو شتێکی بینراوەوە، بەڵام لەو لایەنەوە نیگای شتەکانی دەکرد، ئەوەی لای ئەو شایستەی بینین بوو دەیناسیو لەو جیهانەدا بۆ شوێنی خۆی دەگەڕا، چونکە خوازیاری حەقیقەت نەبوو، چیتر ئامانجی ئەو لەودیو شتەکانەوە نەبوو، ئەوکاتەی کە بەم شێوەیە تەماشای گەردوونی دەکرد، ئەو شتانەی بەشێوەیەکی جوانو سادەو منالانە دەسکەوت، مانگو ئەستێرەکان جوان بوون، کەناری دەریا، گوڵەکان، بەردەکان، بزنەکان، قالۆنچە ئاڵتونی ڕەنگەکانو باڵندەکان، هەموویان جوان بوون، تەماشاکردنی ئەو جیهانەی خاڵیی لەکۆتو بەندو گومان، ئەوەندە سادەو ڕوناک بوو گەلێ جوانو دڵگیر خۆیدەنواند، لە شوێنێکدا دەیبینی خۆرەتاو بە چڕی دەسوتاو، دەشی سوتاند، لە شوێنێکی ترداو لە سێبەری درەختەکانی دارستاندا هەستی بەسەرما دەکرد، شوێنێکی تری پەیداکرد پڕبوو لە کاڵەکو مۆز، شەوەکانو ڕۆژەکان تەواوبوون، کاتژمێرەکان تێدەپەڕین وەک ئەو بەلەمانەی کە بەرەو دەریای زەمەن چارۆکەیان هەڵدابوو، ئەو لە ژێر هەر چارۆکەیەکدا بەلەمێکی دەدۆزیەوە کە هەڵگری گەنجینەکانی شادیو سەعادەت بوو، کۆمەڵێک لەو مەیمونانەی بینی لەناو جەرگەی دارستاندا بەسەر شالقی درەختەکانەوە بە هەموو لایەکدا هەڵدەبەزنەوەو گوێی لە ئاوازی شەیدایی ئەوانیش گرت، بەرانێکی بینی کەوتە دوای مەڕێکو لە گەڵیدا جووت بوو، باڵندە ماسی خۆرەکانی بینی دەمەو ئاوابوون چۆن لەتاو برسیەتی بەرزدەبنەوە بەسەر دەریاچەکانداو سەرقاڵی ڕاوکردنن، کۆمەڵێک ماسی بریسکەدارو درەوشاوەش لەترسی ئەو باڵندە ڕاوچییانە دوور

دەکەوتنەوە، لەناو ئەو گێژەنانەشەوە هێزو ئارەزوو شەیدایی خۆیدەنواند کە پەناگای ماسیەکان بوو،و بۆ ئەوێ هەڵدەهاتن.

هەمیشە ئەوانە هەرئاوا هەبوون، بەڵام پێشتر سیدهارتا ئەمانەی نەدەبینیو خۆی لەو شوێنەدا نەدەبینیەوە، چیتر لەو شوێنەدا کەبەسترابوو بەوشتانەوە، بەچاوی خۆی ڕۆشناییو سێبەرەکانی بینی، هەر بەعەقڵ خۆی لە مانگو ئەستێرەکان بەئاگاهێنایەوە، سیدهارتا لەماوەی ئەم گەڕانو ڕێگابڕینەدا، هەموو ئەوەی بیرکەوتەوە کە لەباخی "جیتاوانا" بەسەری هاتبوو، پەندو ئامۆژگاریەکان، ئەو چرکەساتانەی کەپەندەکانی بودای پیرۆزی بیستبوو، جیابوونەوەی لە گۆڤیندا، قسەوباسەکانی لەگەڵ بودای تاقانەدا هەمووی بیرکەوتەوە، هەرقسەیەک کە لەبودای مەزنی بیستبوو، لەزەینیدا مابوو، بەڵام سەری سوڕمابوو لەوقسانەی خۆی کە کردبوونیو تا ئەوساتەش بێئاگابوو لەوەی کەچی وتووە بە بودا؟ "ئەو چی وتبوو بە بودا؟ وتبووی نهێنیو حیکمەتەکانی بودا نابنە وانەیەک بۆ فێربوون، هەرگیز ناگونجێنو بەرجەستە نابنو ناچنە سنورەکانی لێکدانەوەو پێناسەکردنەوە، هەربۆیە خۆشی دەرگیربوو لەگەڵ ڕۆشن بوونەوەی زەینیدا، ئەو حاڵەتە تایبەتەی کە بودا لەساتەکانی ڕۆشنبوونەوەی زەینیدا بەدەستیهێنابوو، خۆشی توانی ئەزموونی ئەو حاڵەتە زەینیە بکاتو بەدەستی بهێنێت.

دێرزەمانێک بوو سیدهارتا وەک براهمایەک دەیزانی کە نەفسی "ئاتمان"ی خۆی دەبێتە هەمان سروشتی جاویدانی، بەڵام هەرگیز نەیتوانی بوو ببێتە خاوەنی نەفسی خۆی، بەڵکو گیرۆدە بووبوو بەو جەنگەوە کە دەبێت بە بیرکردنەوەکانی نەفسی خۆی ببەستێتەوەو





زنجیری بکات، هەروەها بەهۆی ئەو جەستەو تێگەشتنو بیروهەستو هونەرو حیکمەتەوە کە خۆی هەیبوو، یاخود لەڕێگەی مەعریفەوە بەدەستیهێنابوو دەیتوانی لەبیرکردنەوە باوەکانەوە بیرکردنەوەی تازە بەرهەم بهێنێت.

هەرچەندە ئەمانە هەموویان پەسەندکراووی نەفسی سیدهارتا نەبوون، نەخێر، جیهانی بیرکردنەوەی سیدهارتا پەیوەندی بەم لایەنەوە هەبوو نەک لەو دیو شتەکانەوە، لەناوبردنی نەفسو دانانی بیری هۆشمەندانە لە جێگەی نەفس، کەس ناگەیەنێتە دوا مەبەستی خۆی، "بیرو هەست" هەردووکیان باشو گرنگن. هەروەها لەپشتی ئەمانەشەوە دواهەمین واتا پەنهانە، کەواتە نرخی ئەوەیان هەیە گوێ لە هەردووکیان بگرینو یاری بە هەردووکیان بکەین، پاشان نابێت بە خراپیان بزانینو کردەی سزادانیش بۆ ئەو جۆرە حاڵەتانە لەگۆڕێ نییە، بەڵکو دەبێت گوێ لە ئاوازی هەردووکیان بگرین.

ئەو بەدوای شتێکدا وێڵبوو کە ئاوازێک لە ناوەوەڕا فرمانی بەسەردابدات، بۆئەوەی چیتر وێڵو سەرگەردان نەبێتو بە هەموو لایەکدا نەڕوات.

بۆچی کاتێک گوتاما کاتژمێری درەوشانەوەو ڕۆشنبوونەوەی هزر لە ناخیدا دەرکەوت، ئەو لە ژێر درەختی "بۆ" دانیشتبوو؟

بودا ئاوازێکی بیست، ئاوازێک لە ناخی دڵی خۆیەوە هاتو فەرمانی پێکرد بچێتە ژێر ئەو درەختەو لەوێ بەختەوەریو ئارامی بە دەستبهێنێت، ئەو هەرگیز دەرگیرنەبوو لەگەڵ جەنگی لەناوبردنی گۆشتی جەستەو قوربانیدانو دەستنوێژو خواپەرستیو خواردنو نۆشینو خەوو خەیاڵدا، تەنها گوێی بۆ ئەو ئاوازە ڕادێرا، ملکەچی

هیچ فەرمانێکی تر نەبوو، تەنها ئەو دەنگو ئاوازە بوو، وابەستە بوونو خۆئامادەکردن بۆ بیستنی ئەو ئاوازە خراپ نیەو زۆر پیویستە، هیچ شتێکی تر بەم ئەندازەیە پێویست نیە.

سیدهارتا، ئەو شەوەی لە کوخێکی حەسیری بەلەمەوانێکدا بردەسەرو لەوێ خەوێکی بینی... لەخەویدا گۆڤیندا بە عابای زەردی کاهینەکانەوە لە بەرامبەریدا وەستاو سەیری سیدهارتای کردو وتی: بۆچی وازت لەمن هێنا؟ لەوکاتەدا گۆڤیندای ماچکردو گۆڤینداش هەردوو دەستی کردە ملیو لەخۆیی نزیک کردەوەو تێر ماچیکرد، لەوکاتەدا سەیریکردو راما کە ئەوە گۆڤیندا نیە، بەڵکو بوو بە ژنێکو لە ژنەکەوە گەردنێکی تەواو دەرکەوت، سیدهارتا لە مەمکەکانی شیرێکی شیرینو بەهێزی نۆشی، ئەو شیرە تامی ژنو مێردایەتی، خۆرو دارستان، گوڵەکانو ئاژەڵەکان، تامی هەموو میوەکانو هەموو چێژەکانی تری دەداو ئێجگار شیرین بوو، هەرکە سیدهارتا بە خەبەرهات لە دەوروبەری خۆی راماو سەیریکرد تەنها رووبارێکی رەنگ پەریوە بە کەناری ماڵۆچکەی بەلەمەوانەکەدا گوزەردەکاتو لە دارستانەوە زایەڵەی خوێندنو هاواری بایەقوشێک دەبیستریێ.

کات بەیانی بوو، سیدهارتا داوای لە بەلەمەوانەکە کرد بیگەیەنێتە ئەوبەری رووبارەکەو بیپەڕێنێتەوە، بەلەمەوانەکەش بە بەلەمە حەیزەرانیەکەی خۆیەوە سیدهارتای پەڕاندەوە بۆ ئەوبەری رووبار.

رووی پانو بەرینی ئاو لەبەر رۆشنایی بەیانیداو لە رەنگێکی سورباوی سافدا، ئەدرەوشایەوە. سیدهارتا بە بەلەمەوانەکەی وت: ئەم رووبارە زۆر جوانە، بەلەمەوان وتی: بەڵێ... ئەم رووبارە زۆر جوانە، من ئەم رووبارەم لە هەموو شتێک زیاتر خۆشدەوێ، چەند





زیاد گوێی لێبگرم، زیاتر پێی سەرسام دەبمو تێیدا ئاڵودەی شتێک دەبمو شتێکیش فێردەبم، ئەزانی لەرووبارەوە دەتوانیت زۆرشت فێر ببیت.

لەوکاتەدا سیدهاتا لە کەنار رووبارەکە خەریکبوو لە بەلەمەکە دابەزێت، وتی: ئەی پیاوچاک، زۆر سوپاست دەکەم، داوای لێبوردن دەکەم کە دیاریەکم نیە پێشکەشی تۆی بکەم، پارەیەکو کاڵایەکم نیە تاکو پاداشتی ئەو چاکەیەت بدەمەوە، من پیاوێکی بێ ئافرەتو براهمازادەو خەڵوەتکێشم.

بەلەمەوانەکە وتی: من هەموو ئەمانەم دەزانیو چاوەڕێی دیاری وەرگرتنو پاداشتێک نەبووم لە تۆ، بەڵام دەزانم رۆژگارێکی تر تۆ ئەو چاکەیەم لەگەڵدا دەکەیت. سیدهارتا کەمێک بە گاڵتەکردنەوە وتی: بەڕاستی تۆ بەمجۆرە بیردەکەیتەوە؟

– باوەڕبکە، من لە رووبارەوە فێری ئەوە بووم، کە هەرکەسێکو هەرشتێک دواجار دەگەڕێتەوە، ئەی سامانا تۆش دەگەڕێیتەوە، دەخوازم سەلامەت بیت، وازبێنە... با دۆستایەتی خۆت ببێتە پاداشتی کارەکەی من، ئومێدەوارم لەوکاتانەدا قوربانی پێشکەش بە خوداکان دەکەی، منیشت لە بیربێت.

بەزەردەخەنەیەکەوە لە یەکتر جیابوونەوە، وادیاربوو سیدهارتا حەز بە دۆستایەتی بەلەمەوانەکە بکات، بیری لەوەکردەوە کە ئەویش وەک گۆڤیندا دەمێنێتەوە، بەخۆی وت: هەموو ئەوانەی کە لەسەرەڕێدا دەیانناسم، وەک گۆڤیندا دەمێننەوە، هەموویان پێزانو سوپاسگوزارن، لەکاتێکدا ئەو سوپاسو شوکرانە هی خۆیانو بۆ خۆیانە، هەموویان زمانلوسنو حەز بە دۆستایەتی من دەکەنو دەیانەوێ گوێڕایەڵی من

بن‌و کەم بیربکەنەوە، ڕاستە خەڵکی منالّ دەبنەوە.

نزیکی نیوەڕۆ بە گوندێکدا تێپەڕی، منالاّن لە کۆلاّن‌و لەبەرامبەر ماڵە قوڕینەکاندا نوقمی یاریکردن بوون، ئەوان بە سەدەفو بەرد یارییان دەکرد، یەکتریان بانگ دەکردو زۆرانبازیان دەکرد، بەڵام کاتێ سامانەی نامۆو بێگانەیان بینی هەریەکە بە لایەکدا هەڵهات، جادەکەش لە کۆتایی ئاواییداو بە قەراغ جۆگەیەکدا بەردەوامو درێژکشابوو، لە قەراغی ئەو جۆگەیەشدا ژنێکی جوان جلەکانی خۆی دەشۆری، سیدهارتا سڵاوی لێکردو ژنەکە بە زەردەخەنەیەکەوە سەری هەڵبڕی، سیدهارتا سپیەتی ددانەکانی بینی‌و بە پێی نەریتی گەشتیارو گەڕیدەکان پرسیاری لە ژنەکە کردو لێی پرسی: ماوەی دووری نێوان ئەوشوێنەو شار چەندە؟ ئینجا ژنەکە هەستایە سەرپێ‌و لێی نزیک کەوتەوە، لێوە شێدارەکانی لە ڕووخسارە جوانەکەیدا دەدرەوشانەوە، پرسیار گەلێکی زۆری لە سیدهارتا کرد، ئایا نانی خواردووە؟ ئایا ڕاستە " سامانا" کان لە دارستاندا شەوانە تەنیا دەخەون‌و بوارو مۆڵەتی ئەوەیان نیە ژنێکیان بۆ خۆیان هەبێت؟ پاشان پێی چەپی خۆی خستە سەر پێی ڕاستی سیدهارتاو هەروەک چۆن ژنێک پیاوێک دەعوەت بکا بۆ ڕابواردن‌و چێژوەرگرتن لە عەشق، بەو کارو ڕەفتارەی کە پاکیزەکاران بە ڕووخان‌و دارمانی شەجەرە ناوزەدیدەکەن، ئیشارەتێکی کردوو سیدهارتای دەعوەتکرد بۆ لای خۆی، سیدهارتا هەستی کرد کە خوێنی جۆشدراوە، خەوی دوێنێ شەوی بیرکەوتەوە کە چۆن ئەوی ناسی، پاشان زیاتر لە ژنەکە نزیکەوتەوەو حەپەسا، سەرگۆی قاوەیی مەمکەکانی ماچ کردو بەوردی سەیریکردو بینی ئەو ژنە چ زەردەخەنەیەکی شیرینی لەسەر





لێوانە، چاوەکانیشی پڕن لە ئاواتو بانگردن‌و پێکەوە بوون. سیدهارتاش لەناوخۆیدا هەستی بە شەیدابوونێکی ئێجگار سەیردەکرد، هەرچەندە تائەو چرکەساتەش دەستی بەرجەستەی هیچ ژنێک نەکەوتبوو، سەرباری ئەوەش بازوەکانی ئامادەی لە ئامێزگرتنی ئەو ژنە بوون.

سیدهارتا ساتێک بە گومانەوە وەستاو گوێی لە ئاوازی دەرونی خۆی بوو، دەنگێک لەناخیدا بانگی کرد نەکەی...، لەوکاتەدا ژنەکە هەموو ئەو سیحرو جادووە لە ڕووخسارە خەندانەکەیدا دورکەوتەوەو سیدهارتاش لە ڕوخساری ئەودا جگە لە ڕوخساری ژنێکی جوان‌و درەوشاوە شتێکی دیکەی بەدی نەکرد، بە ئارامیەوە نەوازشی گوناکانی کردو بەپەلە لەپەنای ئەو ژنە نیگەرانەدا دورکەوتەوەو ڕۆشتە ناو قامیشەڵانەکەوە، پاش ئەوەی خۆرئاوابوو، بەوشەوە گەشتە شارێکی گەورەو زۆر خۆشحاڵ بوو، لەناخیدا هەستی بە تامەزرۆییەکی بەهێز دەکرد بۆ ئاوێزانبوونی لەگەڵ خەڵکیدا، چونکە ماوەیەکی دوورو درێژی بەسەربردبوو لە سێبەری درەختەکانی دارستاندا، شەوی ڕابردوو کوخی حەسیری بەلەمەوانەکە یەکەمین سەقفێک بوو لە دوای ئەو هەموو ماوە دورو درێژەوە بەسەر سەرییەوە بیبینێ.

ئەم پیاوە سەرگەردانە لە دەرەوەی شار، لە قەراغ باغێکی بێ پەرژیندا کۆمەڵێ ژن‌و پیاوی خزمەتکاری بینی گۆزەیان لەسەرسەر داناوەو ڕێدەکەن، گالیسکەیەکی بینی لەناو خزمەتکارەکاندا چوار کەس ڕایدەکێشن‌و ژنێک خاتوونیانەو لەسەر پێخەفە سووروباوەکان‌و لە پشتی پەردە ڕەنگینەکانەوە لە گالیسکەکەدا دانیشتوە، سیدهارتا

بێجووڵە بەرامبەر دەروازەی باغەکە وەستاو تەماشای ئەو دەستە پیاوو ژنە خزمەتکارو زەمبیل بەدەستانەی دەکرد، سەیرێکی گالیسکەکەی کردو ئافرەتێکی تێدا بینی، لە ناو خەرمانەی قژە ڕەشەکانیدا ڕووخسارێکی ئێجگار درەوشاوەو شیرین‌و سەرنجڕاکێشی بەدیکرد، دەمیشی لە هەنجیرێک دەچوو کە تازە کرابێت بە دوولەتەوە، برۆ جوانەکانی لەتیروکەوانێکی مەزنی ئاسمانیەوە نەخشێنرابوون، لەمەچەکو چاوە ڕەشەکانی ڕوانی کە ئارەزووی ئەویان تێدا دیاربوو، تەماشای گەردنە سافو باریکەلانەکەی کرد کە بەسەر جلە سەوزو ئاڵتونیەکانیدا دەیڕوانی، دەستەکانی خڕن‌و میهرەبان، پەنجەکانی باریکو شمشاڵی، مەچەکی پڕبوو لە دەسبەنی تەلایی، سیدهارتا لە عەزرەتی بینینی جوانیی ئەو ژنە دڵی کەوتبووە لێدانێکی بەپەلە بۆی، هەر کە گالیسکەکە لێی نزیک کەوتەوە، بەڕێزەوە سڵاوی لێکرد، کاتێک سەری هەڵبڕی قەدەرێک لەو ڕووخسارە جوانەو لەوچاوە وردو سەرنجڕاکێشانەی ڕوانی، یەکسەر حەیرانی بوو، هەوا بۆنی عەتری ئەوی گرتبوو، سیدهارتاش لەتاو ئەو ناسینەدا ماتو مەلوولو پڕ بەسیەکانی هەوای هەڵمژی، ژنە جوانەکە کەمێک سەری جوڵاندو زەردەخەنەیەکی کردو پاشان لەناو درەختی باخەکەوەو لەدوای خزمەتکارەکانیەوە لەچاو ونبوو.

سیدهارتا بەخۆی وت "من لەگەڵ خۆری خۆشبەختیدا دەچمە ناو ئەم شارەوە"، لە ناخیدا هەستی بەئارەزوویەکی قووڵ دەکرد بۆچوونە ناو ئەو باخەوە، بەڵام خۆی ڕاگرتو ئەوەی وەبیرخۆی هێنایەوە کە پیاوان‌و ژنە خزمەتکارەکان چۆن تەماشایان دەکرد، ئەو نیگایانەشی لەخەیاڵدابوو کە بەچاوێکی سوکو بچوکو پڕ گومانەوە





لێیان دەڕوانی.

بەخۆی وت "من هێشتا سامانایەکم، هێشتا خەڵوەتکێش‌و سواڵکەرێک زیاتر هیچیتر نیم، بەمشێوەیە ناتوانیت بمێنیتەوەو ناتوانیت بەو سەروسیماو هەیکەلەوە بچیتە ناو ئەو باغەوە". پاشان زەردەخەنەیەکی کردو گەڕایەوەو پرسیاری لەو کەسە کرد کە یەکەمجار لەسەر ڕێگاکەیدا بینیبووی، لەبارەی ئەو باغو ژنەوە پرسیاری لێکرد، لەوە حاڵیبوو کە ئەو باغە هی ئەو "کەماڵە" سۆزانیە بەناوبانگەی شارە، زانی ئەو ژنە جگەلەو باغە، لەشارداو لە ماڵەکەی خۆشیدا باغێکیتری هەیە، پاشان ڕۆشتە شارەکەوەو ئامانجێک زیاتر خولیای تری نەبوو، هەر بەدوای ئەو ئامانجەشدا لەشاردا کەوتە گەڕان‌و کەوتە ناو جەنجاڵی شەقامەکانەوە.

لەهەندێک شوێندا بێجوڵە دەوەستاو لەسەر پلیکانەی کەنار ڕووبارەکەدا هێمن بووەوە، دەمەو ئاوابوون لەگەڵ کەسێکدا ئاشنایی پەیداکرد کە لە سەرتاشخانەیەکدا شاگردبوو، لەژێر تاقە ساختومانێکدا سەرقاڵی کارکردن بوو.

پاشان ئەو هاوڕێیەی بینی لەپەرستگای "ڤیشنۆ" خەریکی خواپەرستی بوو، دواتر چیرۆکی ڤیشنۆو لاکشمی بۆ گێڕایەوە، ئەو شەوەی لە بەلەمێکی کەنار ڕووباردا بردە سەر، بەیانی بەر لەوەی یەکەمین مشتەری بێتە دوکانەکەی، شاگردەکە ڕدێنە درێژو ئاڵۆزکاوەکەی بۆ تاشیو قژی بۆ کورتکردەوەو ڕۆن‌و کرێمە بۆن خۆشەکانی دا لەسەرو ڕیشی، پاشان بەمەبەستی خۆشۆرین بەرەو ڕووبارەکە کەوتە ڕێ، دەمەو عەسرانێک لەوکاتەدا کەماڵە بەسەر بەرزایی گالیسکەکەیەوە نزیکی باغەکەی خۆی دەبووەوە، سیدهارتا

لەبەرامبەر دەروازەی باغەکە ڕاوەستابوو، سڵاوی لێکردو لەپڕ لەو ئافرەتە سۆزانیەوە گوێی لە دوعاو نزایەک بوو، سیدهارتا ئەو خزمەتکارەی بانگکرد کە دواهەمین کەس بوو لەوانەی بەدوای گالیسکەکەوە بوون‌و داوای لێکرد بە شابانوەکەی بڵێ کە براهمایەکی لاو هاتوەو دەیەوێ قسەی لەگەڵدا بکات، پاش کەمێک خزمەتکارەکە گەڕایەوەو داوای لە سیدهارتا کرد لەگەڵیدا بڕوات بۆ لای، بەبێدەنگی ڕێنمایکردو ئەو تاقەماڵەی نیشاندا کە لەوێ کەماله لەسەر تەختێکی شاهانەیی دانیشتوە، پاشان خزمەتکارەکە لەوێ سیدهارتای بەجێهێشت.

کەماله لێی پرسی: باشە تۆ ئەو کەسە نیت کە دوێنێ لەبەردەرکی باخەکەدا وەستابوویت‌و سڵاوت لێکردم؟

سیدهارتا وتی: بەڵێ من ئەو کەسەم کە دوێنێ تۆم بینی‌و سڵاوم لێکردیت.

– بەڵام دوێنێ مەگەر تۆ سەرو ڕیشێکی درێژو تۆزاویت نەبوو؟

– تۆ هەرچیەکت دیوە هەمویت باش بینیوە، تۆ دوێنێ سیدهارتای براهمازادەت بینی، ئەو پیاوەی کە لەپێناوی ئەوەی ببێتە سامانا، ماڵی باوکی جێهێشتوەو بەدرێژایی سێ ساڵ خەڵوەتکێش بووە، بەڵام ئەوەتانێ من لەو ڕێگەیە گەڕاومەتەوەو هاتووم بۆ ئەم شارە، لەسەرەتاداو پێش ئەوەی بچمە ناوشار، یەکەمین کەسێکیش کە بینیم تۆ بوویت، هەروەها هاتووم بۆ ئێرە تاوەکو پێت بڵێم.. ئەی کەماله، تۆ یەکەمین ژنێکی سیدهارتا قسەی لەگەڵ بکات بەبێ ئەوەی چاودابخات‌و لەزەوی بڕوانێ، چیتر من لەگەڵ بینینی ژنێکی جواندا چاوەکانم داناخەم‌و سەیری بەردەمم ناکەم.





کەماله پێدەکەنی‌و یاری بەو باوەشێنەی دەکرد کە لەپەڕی تاوس دروستکرابوو، پرسی: ئایا سیدهارتا تەنها لەبەرئەوە هاتووە بۆ ئێرە کە ئەوە بە من بڵێ؟

– هاتووم ئەمەت پێبڵێم‌و سوپاست بکەم، چونکە تۆ جوانی ئەی کەماله، ئەگەر لێم نارەنجێیت ئەمەوێ داوات لێبکەم دۆستو مامۆستای من بیت، چونکە من شتێک لەو هونەرە نازانم کە تۆ تێیدا مامۆستای.

کەماله بەدەنگی بەرز دایە قاقای پێکەنین.

– تاکو ئێستا ئەزموونی وام نەبووە کە سامانایەک لەجەنگەڵەوە بێت‌و ئارەزوی ئەوە بکات شتێک لەمنەوە فێرببێت، پێشتر هیچ کاتێک خەڵوەتیەک بەقژی درێژو پارچە قوماشێک بەکەمەریەوە نەهاتوەتە لام، پیاوانی لاوو براهمازادەی زۆر دێنە لای من، بەڵام ئەوانە هەمیشە کراسی جوان‌و گرانبەهایان لەبەردایەو پێڵاوی جوانیان لەپێدایەو بۆنی عەترێکی دڵگیر لەموەکانیان دێت‌و گیرفانیان پڕە لەپارە، ئەی سامانا، پیاوانی لاو بەم جۆرە دێنە لای من.

سیدهارتا وتی: ئەوەتا لێرەوە دەستمکرد بە فێربوون، دوێنێ شتێک فێربوومو بەو مەبەستەش ڕیشم تاشی‌و عەترم کرد بە موەکانمداو شانەم کرد، ئێستا ئەی خانمی بەڕێز، جگە لە کراسێکی گرانبەهاو پێڵاوی جوان‌و گیرفانی پڕ لە پارە لە شتێکم کەم نییە، سیدهارتا پێشتر کە بڕیاری بەدەستهێنانی شتە گەورەو بەنرخەکانی داوە هەموویانی بەدەستهێناوە، بۆیە بۆ بەدەستهێنانی ئەم شتە بێ نرخانە زەحمەتێکی وا ناکێشێت، باشە ئەوەی کە دوێنێ بڕیارمدا ئەمڕۆ بە دەستمهێنا، بۆچی دەبێت ئێستا نەتوانم ئەوەش بە

دەستبهێنم، من مەبەستمەو حەزدەکەم دۆستی تۆبمو وانەی چێژەکانی عەشق لە تۆوە فێربم، تۆ من بە قوتابیەکی زۆر باش دەبینی، ئەی کەماڵە.. من کۆمەڵە شتێکی زۆر زەحمەتتر لەوانەی کە تۆ فێرم دەکەی بە ئاسانی فێربووم، کەچی دەبینم بەم شێوەیەو لەم حاڵەتەدا سیدهارتا بە مووی عەتراویەوەو بەبێ کراسی گرانبەهاو پێڵاوی جوانو گیرفانی پڕەوە لای تۆ بەکەڵک نایەت.

کەماڵە پێکەنیو وتی: نەخێر، بەبێ ئەو شتانە سیدهارتام بەدڵ نیەو دەبێت کراسی ناوازە لەبەربکاتو پێڵاوی بەنرخ لەپێ بکاتو پارەی زۆر بدات بە کەماڵەو دیاری زۆری پێبێت، ئەی سامانا، تۆ کە لە دارستانەوە هاتوویت، ئایا ئەمانە دەزانی؟ لەهەموویان تێگەیشتویت؟

سیدهارتا وتی: زۆر باش تێدەگەم، دەمولێوێک بەو هەموو جوانیەوە قسەبکات چۆن دەبێت شەیدای واتای قسەکانی نەبم؟، دەمی تۆ لە هەنجیرێکی تازە دەچێتو کرابێت بە دوو لەتەوە، لێوەکانیشت تازەو سورو جوانن، بەڵام ئەی کەماڵەی جوان بڵێ... ئایا تۆ ناترسیت لە سامانایەکی جەنگەڵی کە هاتبێت وانەی عەشق فێربێت؟

– چۆن دەبێ لە سامانایەکی گەمژە بترسم کە لە دارستانەوە هاتووەو هاودەمی چەقەڵەکان بووەو هیچ شتێک دەربارەی ژنان نازانێت؟

– ئای.. نازانی سامانایەکی جەنگەڵی بەهێزەو لە هیچ شتێک ناترسێت، دەتوانێت لەگەڵ تۆدا شەڕانگێزبێتو ئازارت بدات.

– نەخێر... ئەی سامانا من هیچ ترسێکم نیە، باشە هەرگیز سامانایەک یان براهمایەک ترساوە لەوەی کە کەسێک بتوانێت





زانستو میهرەبانیو هێزی بیرکردنەوەی ئەو بۆ خۆی ڕاکێشێت؟ نەخێر، چونکە ئەمانە کۆمەڵە شتێکن پەیوەندیان بەوەوە هەیە کە ئەو کەسە خۆی دەتوانێت ئەمانە بە کەسانێک ببەخشێت کە خۆی پەسەندیان دەکات، ئەمەش لەکاتێکدا کە مەیلو ئارەزووی ئەم کارەی هەبێت، حاڵەتی کەماڵەو چێژەکانی عەشقیش بەهەمان شێوەیە، بەڵێ لێوەکانی کەماڵە جوانو سورن، بەڵام ئەگەر تۆ بە پێچەوانەی مەیلو ئارەزووی کەماڵەوە ماچیان بکەی هێندەی گەردێک تامی شیرینی لەولێوانە ناکەیت، وەک بڵێی ئەو لێوانە خۆیان باش دەزانن چۆن شیرینبنو شیرینی ببەخشن، ئەی سیدهارتا، تۆ لە قوتابیەکی باش دەچی، وەرە ئەم شتەش فێربە، ئەتوانی بەخێرو سەدەقە عەشق وەرگری، یان بیکڕی یان وەک دیاریەک قەبوڵی بکەی یان لەسەر ڕێگایەک بیدۆزیتەوە، بەڵام عەشق، هەرگیز ناتوانی بیدزیت، تۆ خراپ حاڵی بوویت، بە ڕاستی حەیفە لاوێکی باشی وەک تۆ بەهەڵەدابچێت.

سیدهارتا بەڕێزێکەوە زەردەخەنەیەکی کردو وتی: ئەی کەماڵە، تۆ ڕاست دەکەی، بە ڕاستی زۆر حەیفە، نەخێر... حەیفەو نابێت دڵۆپە شیرینەکان لەسەر لێوەکانی تۆو لێوەکانی من کەم بکەن، هەرکاتێک سیدهارتا کراسی گرانبەهاو پێڵاوو پارەی بەخۆیەوە بینیو توانی ئامادەیان بکات، کە چەند بەپەلە عەودالە بەدوایاندا، ئەوکاتە دەگەڕێتەوە لای تۆ، بەڵام ئەی کەماڵەی جوان... ئایا دەکرێ پەندو ئامۆژگاریەکم پێبڵێیت؟

–پەندو ئامۆژگاری؟ ئەی بۆ نا؟ چۆن دەبێت پەندو ئامۆژگاری بە سامانایەکی هەژارو نەزان نەڵێم کە لەناو چەقەڵەکانی دارستانەوە هاتووە؟

– ئەی کەماڵەی جوان، من بۆ ئەوەی ئەو سێ شتە، واتە جلو پێڵاوو پارە بەزوترین کات پەیدابکەم، پێویستە بەرەو کوێ بچم؟

– ئەی دۆستی من، خەڵکانێکی زۆرو بێشومار لە هەوڵی زانینی ئەم نهێنیەدان، تۆ پێویستە ئەوەی کە فێری بوویت بەکاری بهێنی، لەدەسکەوتی ئەوەش جلو بەرگو پێڵاو ئامادەکەی، مرۆڤی هەژار ناتوانێت بە ڕێگەیەکی تر پارە پەیدابکات.

– بەڵام من ئەتوانم تەنها بیربکەمەوە، ڕۆژو بگرمو خۆڕاگربم.

– چ شتێکیتر دەزانی؟

– هیچ... بەڵام بۆ نا، شیعریش دەزانم، ئایا تۆ بە خاتری یەک شیعر، ماچێکم پێدەبەخشیت؟

–بەمەرجێک ماچێکت دەدەمێ، کە چێژ وەرگرم لە شیعرەکەت، ناونیشانی ئەو شیعرە چیە؟

سیدهارتا پاش کەمێک بیرکردنەوە، ئەم شیعرەی خوێندەوە:

"دوێنێ کەماڵەی شۆخو شەنگ دەڕۆشتە باغەکەی خۆیەوە
زاهیدێکی لەش سوتاو، خۆربردوو
لەدەروازەی باغدا وەستابوو
کاتێ زاهید ئەوی بینی
بەحورمەتێکەوە سڵاویکرد
بۆ ئەو بێگەردییەی
هێشتا تازەبوو وەک گوڵی نیلۆفەری شین
کەماڵە بە خەندەیەکی شیرینەوە
سڵاوی ئەوی سەندەوە
زاهید لە هۆش خۆی چوو





گەر لەمەودوا
قوربانیەکانم بە کەماڵەی جوان ببەخشم
باشتر دەبێت یان پێشکەشیان بکەم بە خواوەندەکان"

کەماڵە لە خۆشحاڵیدا بەجۆرێک دەستی بەرزکردەوە بۆ چەپڵەلێدان، دەنگی دەسبەنەکانی دەهات، وتی: ئەی زاهیدی سوتاو لە هەتاودا، شیعرەکەی تۆ زۆر جوانە بە ڕاستی ئەگەر ماچێکت پێببەخشم لەبری ئەو شیعرە زەرەرم نەکردوە.

کەماڵە بە نیگایەک سیدهارتای بانگکردە لای خۆیەوە، سیدهارتا ڕوومەتی نا بە ڕوومەتی کەماڵەوەو لێوی خستە سەر ئەو لێوانەی وەک هەنجیرێکی تازە مابوونەوە، کەماڵە ماچێکی دوورو درێژی پێبەخشیو سیدهارتا بەسەر سوڕمانێکەوە پەی بەو نهێنیە بردو تێگەیشت کەماڵە چەند مامۆستایە لە کارەکەی خۆیداو چ دەرسێکیشی فێری ئەم کردووە، چۆن خستویەتیە ژێر کاریگەری خۆیەوە، چۆن بانگی کردە لای خۆیەوە، چەند لێیەوە دووربووە، چۆن دوای ئەو ماچە دورو درێژە، ماچە وردو بچوکەکانیتریش چاوەڕێی ئەویان دەکرد، کە هەریەکەیان جۆرێکیتر بوون.

سیدهارتا بێجوڵە لە جێگەی خۆی ڕاوەستاو بە قوڵی هەناسەی دەدا، لەوکاتەدا لەمناڵێک دەچوو کە بەسەرسوڕمانەوە هەموو نهێنیەکانی دانایی لێدەرکەوتبێت.

کەماڵە وتی: شیعرەکەت جوانەو ئەگەر دەوڵەمەند بوومایە لە بری ئەوە پارەم پێدەدایت، بەڵام بەوپێیەی پارەپەیداکردن بە شیعر زۆر گرفتئامێزە، ئەگەر دەتەوێو خوازیاری ئەوەی دۆستی کەماڵە بیت، دەبێت پارەیەکی زۆرت هەبێ.

سیدهارتا بە زمانێکی لاڵەوە وتی: وای... کەماڵە.... چەند خۆش دەزانی ماچ بکەی.

کەماڵە وەڵامی دایەوە: ئەڵبەتە کە ئەوەندە خۆش دەزانم ماچ بکەم دەستبەرداری جلی گرانبەهاو پێڵاوی جوانو بازنی نایابو شتە باشەکانی تریش نابم، بەڵام تۆ دەتەوێ چ ئیشێک بکەی؟ ئایا جگە لە ئارامگرتنو بیرکردنەوەو ڕۆژوگرتن ئیشێکیتر نازانی؟

سیدهارتا وتی: سرودی مەراسیمی قوربانیەکانیش دەزانم، بەڵام چیتر نامەوێ ئەوانە بڵێمەوە، هەروەها ئاگام لە تەلیسمەکانیش هەیە، بەڵام ئەوە بەکارناهێنم، من کتێبە پیرۆزەکانیش... کەماڵە بەپەلە لێیپرسی: ڕاوەستە.. ئەتوانی بخوێنیتەوەو بنوسیت؟

– بەدڵنیاییەوە دەتوانم، چەندین کەس هەن دەزانن بخوێننەوەو بنوسن.

– نەخێر زۆربەی خەڵک نازانێت، بە ڕاستی ئەوە کارێکی باشەو هەر زۆر باشە دەتوانی بنوسیتو بخوێنیتەوە، لەوانەیە پێویستت بە تەلیسمەکانیش هەبێت.

لەوکاتەدا خزمەتکارێک هاتە ژورەوەو شتێکی بەگوێی کەماڵەدا چرپاند.

کەماڵە وتی: کەسێک هاتووە بۆ لام، سیدهارتا زوو برۆ نەهێڵی هیچ کەسێک لێرەدا بتبینێت، من سبەینێ دەتبینمەوە.

فەرمانی بە خزمەتکارەکەی کرد کە عابایەکی سپی بدات بەو براهما پیرۆزە.

سیدهارتا بێئەوەی بزانێت چ شتێک لە ئارادایە خێرا کەوتە دوای خزمەتکارەکەو بەدوایدا ڕۆشتە دەرەوە.





ڕێگا پێچاو پێچەکانی باغ بردیانە بەردەم ماڵێکو عابایەکی سپییان دایە، لەوێ ڕێنمایی کرا تاوەکو بە ناو چڕی درەختەکاندا لە باغەکەوە بچێتە دەرەوە، ئاگادارکرایەوە لەوەی بێئەوەی کەس بیبینێت خێرا لەوشوێنە دووربکەوێتەوە.

سیدهارتا.. هەرچیەکیان پێوتبوو، بەوپێیەی شارەزاو هۆگری دارستانەکان بوو، بەناو درەختەکاندا ڕێگای خۆی دۆزیەوەو بەسەر پەرژینی باخەکەدا ڕۆشتەدەرەوە، هەربەو دڵخۆشیو ئارامیەوە گەڕایەوە بۆ شار، عابا سپیەکەی لەبندەستا بوو، لە پەنای میوانخانەیەکدا وەستاو کۆمەڵێ کەس نانیان دەخوارد، لەناویاندا بەبێدەنگی ڕاوەستا بۆ سواڵکردنی نان، لە ڕێی خوا هەندێک برنجیان دایە بیخوات، بیری لە خۆی کردەوەو وتی: نەبا سبەینێش نەچم بۆ سواڵکردنی نان، لەناکاو هەستکردن بە غرورێک دایگرت، چیتر ئەو ساماناو خەڵوەتکێش نەبوو، ئەو جوانە نەبوو کە خواردنەکانی بە سواڵکردن پەیدابکات، ئەو برە برنجە پوختەی دا بە سەگێکو خۆی بێ خواردن مایەوە.

سیدهارتا بیرکردنەوەیەکی قوڵ بردیەوەو بە خۆی وت: ئەو ژیانەی خەڵکی لێرە هەیانە زۆر سادەیەو هیچ گرفتێکی تێدا نیە، کاتێک من سامانا بووم هەموو شتێک گرفتئامێزو پڕ زەحمەتو نائومێدکەر بوو، بەڵام هەنوکە هەموو شتێک ئاسانەو سادەیی هەموو ئەو شتانەش هەروەکو سادەیی ماچ بەخشینەکەی کەماڵە وایە، پێویستە جلوبەرگو برێک پارە پەیدابکەم ئەوسا هەمووشتێک دێتەبەردەستم، ئەمانە هەموویان ئەو شتە سادانەن کە خەونی مرۆڤ ناشێوێنن.

سیدهارتا ماڵی کەماڵەی لە شاردا دۆزیەوەو ڕۆژی دواتر چوو بۆ ماڵیان، کەماڵە وتی: کارەکان بەباشی دەچن بەڕێوەو کۆتاییان دێت، کاماسڤاتی چاوەڕێی تۆ دەکات بچیتە دیدەنی، ئەو دەوڵەمەندترین کەسی ئەم شارەیە، تۆ ئەگەر کارێک بکەی ئەو پێیخۆش بێت، ئەوا قەبووڵت دەکاتو دەتبات بۆ خزمەتکردنی خۆی، ئەی سامانای جەنگەڵی... تۆ دەبێت زۆر هۆشیار بی، چونکە من کارێکم کردووە ئەو ناوی تۆی بیستوەتەوە لەناو خەڵکیدا، بۆیە دۆستایەتی لە گەڵدا بکە، ئەو پیاوێکی بە توانایە، بەڵام لەهەمان کاتیشدا زۆر خۆبەکەمزانو ملکەچ مەبە، نامەوێ تۆ ببیتە خزمەتکاری ئەو، بەڵکو دەمەوێ هاوکارو هاوپلەی بیت، بەوشێوەیە زیاتر هەڵسوکەوت نەکەی، ئەگینا لێتدەرەنجێم، کاماسڤاتی خەریکە پیرو تەمەڵ دەبێت، ئەگەر بتوانی ڕازیبکەی لە خۆتو سەرنجیراکێشی، متمانەیەکی زۆرت پێدەکات.

سیدهارتا زۆر سوپاسی کردو پێکەنی، کەماڵە زانیبووی کە ڕۆژی ڕابردوو پێشتریش هیچ شتێکی نەخواردووە، فەرمانی کرد نانو میوەی بۆ بهێننو خۆشی لە خزمەتیدا ڕاوەستا.

کەماڵە پێیوت: تۆ زۆر خۆشبەختیو بەختت باشە، دەرگاکان یەک لە دوای یەک بەرووتدا دەکرێنەوە، وانیە؟ ئایا بۆخۆت تەلیسمێکت هەیە؟

سیدهارتا لە وەڵامدا وتی: دوێنێ وتم من دەزانم چۆن بیربکەمەوەو سەبرم هەبێو ڕۆژو بگرم، بەڵام تۆ هیچ گرنگیت بەمانە نەداو پێتوابوو کە زۆر پووچو بێمانان، بەڵام دەبینی ئەم شتانە زۆر زۆر بەسود دەبن بۆ من، پاشان دەزانی سامانایەکی نەزانی جەنگەڵی زۆر شتی بە سودتریش دەزانێتو زۆر شت فێربووە، پێرێ من





سواڵکەرێکی بێسەروپێ بووم، دوێنێ کەماڵەم ماچکردو ئەمڕۆش دەبمە بازرگانو خاوەن ماڵو پارەو ئەو شتانەیتریش کە تۆ گرنگیان پێدەدەی.

کەماڵە سەری ڕاوەشاندو وتی: بێدەنگ بە، ئاخر تۆ بەبێ من لە کوێ بوویت؟ ئەگەر کەماڵە کۆمەکی نەکردیتایە، چیتدەکرد؟ سیدهارتا وتی: ئەی کەماڵەی ئازیز کاتێک کە هاتم بۆ ئێرەو بۆ دیدەنی تۆو هەنگاوی یەکەمم نا، نیەتی من ئەوە بوو کە لە جوانترین ژنانەوە فێری عەشق بم، هەر لە چرکەساتی ئەو بڕیارەدا بە باشی دەمزانی کەئەوە ئەنجام دەدەم، دەمزانی کە تۆ کۆمەکم دەکەی، من لەیەکەمین نیگای تۆوە لە دەروازەی باغەکەدا ئەوەم زانی.

– ئەگەر من نەمویستایە کۆمەکی تۆ بکەم چی دەبوو؟

– بەڵام تۆش خۆت حەزت بەوە دەکرد، گوێ بگرە کەماڵە... کاتێک بەردێک فڕێیدەیتە ئاوەوە، ئەو بەردە نزیکترینو خێراترین ئەو ڕێگایانە هەڵدەبژێرێت کە دەیگەیەنن بە بنی دەریا، بۆ سیدهارتاش هەر وایە، کاتێک کە ئەو ئیرادەو مەرامو بڕیارو نیەتێکی هەبێت، سیدهارتاش کارێک ناکات تەنها سەبر نەبێت، هەروەها بیردەکاتەوەو ڕۆژو دەگرێ، بەبێ ئەوەی کارێکیتر ئەنجام بداتو جوڵەیەکیش بکات هەمووکارو پەیوەندیەکی جیهان وەک بەردێک بەناو ئاودا تێپەڕبێت، تێکوپێک دەشکێنێت، ئەو نوقم دەبێتو خۆی دەخاتە ناو ئاوەوە، لە چارەنوسی خۆیدا نوقم دەبێت، نایەڵێت بیرکردنەوەیەکی تر بێتە مێشکیەوە جگە لە ئامانجو مەرامی خۆی، ئەمە ئەو قسەیەیە کە سیدهارتا لە ساماناکانی دارستانەوە فێری بووە، ئەو شتەیە کە نەزانو نادانەکان بە سیحرو جادووی دەزانن‌و پێیانوایە کاری دێوو

درنجە، دێوەکان هەرگیز نابنە هۆکاریک بۆ هیچ شتێک، هەر لە بنەڕەتدا دێو بوونی نیە، هەموو کەسێک دەتوانێ سیحرو جادوو بکات، هەموو کەسێ دەتوانێ سەبر بکات، ڕۆژو بگرێو بیربکاتەوەو بە ئامانجی خۆی بگات.

کەماڵە گوێی بۆ دەگرتو نەغمەی دەنگو ئاماژەو جوڵەکانی سیدهارتای خۆشدەویست. کەماڵە وتی: لەوانەشە ئەوەی کە تۆ دەیڵێیت ڕاست بێت، لەوانەیە... چونکە سیدهارتا پیاوێکی جوانەو نیگاکانی ژنان فریودەدات، لەوانەیە وابێت... ئەو شانسی هەیەو خۆشبەختە.

سیدهارتا ماچێکی ئەوی کردو وتی: ئەی مامۆستای من، لەوانەیە بەم شێوەیە بێت، بەڵام بهێڵە با نیگاکانی من پەسەندت کەن، ئومێدەوارم کە شانسو خۆشبەختی لە منەوە بەتۆش بگات.

***





# لەناو خەڵکیدا

سیدهارتا بۆ دیدەنی ڕۆشتە ماڵە شاهانەکەی کاماسڤاتی بازرگانو دەوڵەمەندی شار، خزمەتکارەکان بردیانە ژورەوەو لەسەر فەرشە گرانبەهاکان دایاننا، لەوێ دانیشتو چاوەڕێی کاماسڤاتی بازرگان بوو.

پاش ماوەیەک کاماسڤاتی خۆیکرد بە ژوردا، پیاوێک دڵێکی زیندوو جەستەیەکی نەرم، موەکانی خۆڵەمێشی، چاوەکانی وریاو لێزان، زیرەکو دەمولێوێکی شەهوانی هەبوو، سڵاوێکی دۆستانەیان لە یەکتر کردو بازرگانەکە وتی: وا باسدەکرێت کە تۆ براهماو پیاوێکی هۆشمەندی کەچی بە دوای کاردا دەبیتە خزمەتکاری بازرگانێک، ئەی پیاوی براهما، ئەڵبەتە شتێکت پێویستە بۆیە دەتەوێ کارێک پەیدا بکەی؟

سیدهارتا وتی: نەخێر، پێویستیەکم نیەو هیچ کاتێکیش موحتاج نەبووم، من سەردەمانێک لەگەڵ ساماناکانی دارستاندا ژیاومو لەوێوە هاتوم.

– چۆن دەبێت لەناو ساماناکانی دارستانەوە هاتبیتو پێویستیت نەبێت؟ مەگەر ساماناکان بەتەواوی بێ سەروەتو سامان نین؟

سیدهارتا وەڵامی دایەوە: ئەگەر مەبەستان بارودۆخی منە، من هیچ شتێکم نیەو بە دڵنیاییەوە جگە لە ئیرادەی خۆم خاوەنی شتێکتر نیم، لەم بارەشەوە پێویستم بە هیچ نیە.

-بەڵام ئەگەر شتێکت نیە، چۆن دەتوانی بەردەوامی بە ژیانت بدەی؟

– لەو بارەوە هەرگیز بیرم نەکردوەتەوە، سێ ساڵ لە هەژاریەکی تەواودا ژیام، بەڵام هیچ کاتێک بیرم لەوە نەکردوەتەوە کە چۆن‌و بە چ شێوەیەک بژیم.

– کەواتە تۆ بە ماڵو سامانی خەڵکانیتر ژیانت دەگوزەراند؟

– تا ڕادەیەک بەو شێوە بووە، بەڵام بیرت نەچێت بازرگانەکانیش لەسەر ماڵو سەروەتی ئەوانیتر دەژین.

– چەند باش بۆیدەچیتو قسەدەکەیت، بەڵام بازرگان بە بێئەوەی کارێک بۆ ئەوانیتر ئەنجام بدات، شتێک لە ماڵو سەروەتی ئەوانە وەرناگرن، بەڵکو لە بەرامبەر ئەو شتەدا کە بەدەستی دەهێنێو دەستی دەکەوێت، کاڵاکەی خۆی پێشکەش دەکات.

-کڕین‌و فرۆش پایەی هەموو شتێکە، هەموو کەس وەردەگرێتو هەموو کەس دەدات، ژیان بەم جۆرەیە.

– ها.. ها! بەڵام تۆ کە شتێکت نەبێت چ شتێک دەتوانی بدەیتەوە؟

-هەرکەس ئەو شتە پێشکەش دەکات کە هەیەتی، سوپا هێزەکەیو بازرگان کاڵاکانیو مامۆستا وانەو ئامۆژگاریەکانی، جوتیار بەری ڕەنجی خۆیو ماسی گیرۆدەیی ناو تۆڕەکانی پێشکەش دەکات.

-زۆر باشە، بەڵام تۆ ئەتوانی چی پێشکەش بکەیت؟، چ شتێک فێربوویت کە بتوانی پێشکەشی بکەی؟

-من ئەتوانم بیر بکەمەوە، سەبرم هەبێو ڕۆژو بگرم.

-ئایا هەموو ئەو شتانەی کە تۆ ئەیانزانیو هەتن هەر ئەمانەن؟

-پێم وایە هەر ئەوانەن‌و بەس.





-ئەوانە چ سودێکیان هەیە؟ بۆ نمونە ڕۆژوگرتن چ بەرهەمێکی هەیە؟

-ها... نرخێکی زۆری هەیە، ئەگەر کەسێک شتێکی نەبێت بیخوات ڕۆژوگرتن عاقڵانەترین کارێکە کە دەتوانێت ئەنجامی بدات، بۆ نمونە ئەگەر سیدهارتا فێرنەبوایە چۆن ڕۆژو بگرێت ئەمڕۆ لەلای تۆ یان لای کەسانیتر لە هەوڵو کۆششدادەبوو، بە دوای کاردا دەگەڕا، چونکە برسیەتی ئەم کارەی فێرکردووە، بەڵام سیدهارتا بەم شێوەیەی کە هەیە دەتوانێت بە ئارامی سەبر بکات، ئەو نائارامو بێ حەوسەڵە نیە پێویستی بەکەس نیە، دەتوانێت بۆماوەیەکی دوورو درێژ ئارەزوی خواردن فەرامۆش بکات، ئێستا بینیت ڕۆژوگرتن چەندە بەسودە؟

-ئەی سامانا.. تۆ ڕاستدەکەی، دەقیقەیەک سەبرکە... کاماسڤاتی ڕۆشتە دەرەوەو دەفتەرێکی هێناو خستیە بەردەستی سیدهارتاو لێی پرسی: ئەتوانی ئەمە بخوێنیتەوە؟

سیدهارتا سەیری دەفتەرەکەی کردو تێیدا بەڵێنامەیەکی فرۆش‌و مامەڵەی تێدا نوسرابوەوە، هەموو خاڵبەندیەکانی بۆ خوێندەوە.

کاماسڤاتی وتی: زۆر باشە، دەتوانی شتێک لەسەر ئەم لاپەڕەیە بنوسی؟

پاشان قەڵەمو کاغەزێکی دایە دەست سیدهارتاو ئەویش شتێکی لەسەر نوسیو خستیەوە بەردەستی کاماسڤاتی، کاماسڤاتی سەیری کرد لەسەر کاغەزەکە نوسیویەتی "نوسین باشەو بیرکردنەوە لەو باشترە، هۆشیاری باشەو سەبر لەو باشترە".

بازرگان دەستخۆشی لێکردو وتی: چەند جوان دەنوسیت، ئێمە

دەبێت دەربارەی زۆر شت لەگەڵ یەکتردا بدوێینو قسەوباس بکەین، من ئەمڕۆ دەعوەتی تۆ دەکەمو دەبێت میوانی من بیتو لەماڵی مندا بمێنیتەوە.

سیدهارتا دوای سوپاسو پێزانین، دەعوەتەکەی قەبوڵ کرد.

ئیتر لەوڕۆژەوە سیدهارتا لەماڵی ئەو بازرگانە دەژیاو جلی گرانبەهای دەپۆشیو پێڵاوی جوانی لەپێ دەکردو خزمەتکارەکانی هەموو رۆژێک حەمامیان بۆ ئامادە دەکردو هەموو رۆژێک دووجار خواردنیان لێدەنا، بەڵام سیدهارتا یەک ژەم لەسەر سفرە دادەنیشتو گۆشتیشی نەدەخوارد، شەرابی نەدەنۆشی، کاماسڤاتی دەربارەی بازرگانیی قسەوباسی لەگەڵدا دەکردو کەلوپەلو شوێنی کاڵاکانو مامەڵەو شتەکانی خۆی پیشاندا، سیدهارتا کۆمەڵە شتێکی زۆرو تازە فێربوو، قسەی زۆری دەبیستو زۆر کەمیش قسەی دەکرد، هەمیشە قسەکەی کەمالەی لەیاد بوو گوێڕایەڵی دەکرد، هەمووکات خزمەتی بازرگانەکەی نەدەکرد، بەڵکو ناچاریشی کردبوو کە لەگەڵ سیدهارتادا وەک کەسێکی هاوپیشەو لەڕیزی خۆیدا ڕەفتاری لەگەڵدا بکات، کاماسڤاتی لەکاری بازرگانیدا زۆر وریاو لەسەرخۆ بوو، بەڵام سیدهارتا جگە لەیارییەک نەیدەتوانی بازرگانی بەشێوەیەکیتر ببینێت، یاساو نەریتەکانی بازرگانی فێربوو، بەڵام ئەمانە هیچیان زەوقو ئارەزوویەکیان لەلا درووست نەکرد، ماوەیەکی زۆر نەبوو لەماڵی کاماسڤاتی دەژیاو بەشداری لەکارە بازرگانیەکانیدا دەکرد، هەموو رۆژێک لەکاتی دیاریکراوی دەعوەتەکانی کەمالەدا دەڕۆشت بۆ ژوانەکانیانو کەمالەی دەبینی، بەو جۆرە جلی گرانبەهای دەپۆشیو کەوشی جوانی لە پێ دەکردو هەندێ جاریش دیاری بۆ کەمالە





دەهێناو لە لێوە سورە پڕ نهێنیەکانی کەمالەوە شتگەلێکی زۆر فێربوو، دەستە نەرمو میهرەبانەکانی شتگەلێکی زۆریان فێرکرد، سیدهارتا لەعەشقدا لە مناڵێک زیاتر هیچیتر نەبوو، شتێکی ئەوتۆی نەدەزانی، بەچاوێکی داخراوو بە شەوقو داگیرسانێکی میهرەبانەوە خۆی فڕێدەدایە قوڵاییەکانی دەریای عەشقەوە، کەمالە فێری ئەوەی کردبوو، بەبێ ئەوەی چێژێک بەهەرکەسێ ببەخشێت ناتوانێت چێژێک بەدەست بهێنێت، ئەم چێژە لەهەموو جوڵەیەکیدا، لە هەر نەوازشێکو هەر دەستپیاهێنانێکداو لەهەر نیگاو لە هەر ئەندامێکی بچوکی جەستەدا خاوەنی نهێنیەکە، ئەوەی چێژ دەناسێتو دەیزانێت، ئاشنایە بەو نهێنیە.

کەمالە ئەوەشی فێرکردبوو، کە عاشقەکان دوای چێژوەرگرتن لەمیوەی عەشق، دەبێت بەبێ سوپاسو چاکەی یەکترو بەبێ هەستکردن بە سەرکەوتنو لەهەمانکاتیشدا دۆڕاون، لەیەکتر جیانەبنەوە، بۆئەوەی هەستکردن بە تێریو گۆشەگیری، یاخود هەستی نەزانکاری لەگەڵ یەکتردا نەیەتە ئاراوە، سیدهارتا ساتە شیرینەکانی لەگەڵ کەمالە دەگوزەراند، خۆیکردبوو بە قوربانی ئەو سۆزانیە جوانەو دۆستو عاشقی ئەو بوو، بەوشێوە لەباوەشی کەمالەدا تێگەیشتو مانای ئەو ژیانەی زانی کە لەکاروبارە بازرگانیەکانی کاماسڤاتی دا نەیدەبینیەوە.

کاماسڤاتی مافی گەیاندنو نوسینو بەڵێنامەی گرنگی پێبەخشیو تەنانەت لەکاروبارە زۆر گەورەو گرنگەکانیدا پرسی پێدەکردو بەشداری پێدەکرد، هەرچەندە زوو لەوە تێگەیشت کە سیدهارتا لە برنجو پەشمو بارکردنو گواستنەوەو بازرگانی شتێکی ئەوتۆ

نازانێت، بەڵام ئامادەباشییەکی باشترو گەورەترو بەبەهاتری هەیە لە ئامادەباشی بازرگان خۆی، لەئاستی ئارامیو بەهێزیو هونەری گوێگرتنو هەروەها بەدەستهێنانی متمانەی ئەوانیتر، زۆر لەبازرگان باڵاترو بەهێزترە.

ڕۆژێک بەدۆستێکی وت: لەڕاستیدا ئەو پیاوە براهما بازرگان نیەو هیچ کاتێکیش نابێتە بازرگانو هەرگیز ئەم کارە سەرنجی ڕاناکێشێت، بەڵام خاوەنی ئەو نهێنیەیە کە دڵخۆشەکانی دنیا تێیدا بەهرەمەندن، بەڵام نازانم ئەو نهێنیە چیە؟ لەوانەیە ڕۆژی لەدیکبوونی لەگەڵ ئەستێرەیەکی خۆشبەختدا بووبێ، یاخود تەلیسمێکی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتبێت، یان دەشێ لەزاهیدەکانی دارستانەوە فێری بووبێ. پێدەچێت ئەو لەکارە بازرگانیەکاندا یاری بکات، لای ئەو بازرگانی لەبنەڕەتەوە هیچ گرنگیەکی نیە، فۆبیای زەرەرکردنی نیەو ترسیشی نیە لە شکست.

دۆستەکەش، بەم شێوەیە ئامۆژگاری بازرگانەکەی کرد: سێ یەکی ئەو قازانجە بدە بەخۆی کە بۆتۆی پەیدا دەکات، بەڵام با لەزەرەر کردنیشدا هەربەو شێوەیەو بەوئەندازەیە بێت، ئەوکاتە مەیلو ئارەزویەکی زیاتر نیشاندەدات.

کاماسڤاتی گوێیگرت لەئامۆژگاریەکانی، بەڵام سیدهارتا هەرگیز گرنگی بەو مەبەستو خواستە نەدەدا، کاتێک کە قازانجی دەکرد بەوپەڕی ئارامیەوە وەریدەگرتو لەکاتی زەرەریشدا پێدەکەنیو دەیوت: ئای.. ئەم مامەڵەیە خراپ تەواوبووە. لەڕاستیدا زۆر کەم گرنگی دەدا بەکاری بازرگانی، جارێکیان ڕۆشت بۆ لادێیەک کە بڕێکی زۆر برنج بکڕێ، کاتێک گەیشتە لادێکە، بازرگانێکیتر پێشتر





برنجەکەی کڕیبوو، بەڵام سیدهارتا چەند ڕۆژێک لەو گوندەدا خۆی ڕاگرتو مایەوەو بوو بەدۆستی جوتیارەکانو میوانداریکردنو دیاری پێشکەش کرد بە منداڵەکانیان، هەروەها لەو سەفەرەیدا بەشداری زەماوەندێکی ژنهێنانی کردو بەوپەڕی دڵخۆشیو ڕەزامەندیەوە گەڕایەوە، کاماسڤاتی سەرزەنشتێکی زۆریکرد، چونکە خێرا نەگەڕاوەتەوەو لەوێ کاتێکی گرنگو پارەو پولێکی زۆری هەروا بەفیڕۆدابوو.

سیدهارتا وتی: ئەی دۆستی من... سەرزەنشتم مەکە، چونکە بە سەرزەنشتکردن شتێکی ئەوتۆ بەدەستنایەت، ئەگەر ئێمە زەرەرمان کردووە، من هەموو ئەو زەرەرو زیانە دەگرمە ئەستۆ، من زۆر بە دڵخۆشیەوە لەو سەفەرەمدا گەڕاومەتەوەو لەگەڵ خەڵکانێکی زۆردا ئاشنایەتیم پەیدا کردوە، لەگەڵ براهمایەکدا بووین بەدۆست، لەوێ منداڵەکان لەسەر ڕانم دانیشتنو جوتیارەکان کێڵگەکانی خۆیانیان نیشاندام، کەس وەکو بازرگانێک سەیری منی نەدەکرد.

کاماسڤاتی وتی: ئەمانە هەمویان باشن، بەڵام بەڕاستی تۆ وەک بازرگانێک ڕۆشتیت یان تەنها بۆ خۆشیو گەشتوگوزار ئەو سەفەرەت کرد؟

سیدهارتا پێکەنیو وتی: بە دڵنیاییەوە من لە پێناو خۆشنودی خۆم ئەو سەفەرەم کردووەو ئاشنای خەڵکانێکی تازەو سەرزەمینێکی تر بوومو چێژم لە دۆستایەتیو متمانەیان وەرگرت، بەڵام ئەگەر کاماسڤاتی بوومایە، دەبوو بەپەلە بگەڕێمەوە، چونکە کڕینی ئەو شتە سەری نەگرتبوو، دەبوو زۆر دڵتەنگو نیگەران بوومایە، ئەوسا ماڵو تەمەن هەردووکیان لەناودەچوون، بەڵام بە پێچەوانەوە من ڕۆژانێکی خۆشم گوزەراندو چەند شتێکی زۆر فێر بوومو چێژو شادیەکی زۆر

یاوەرم بوو، لە ئەنجامی پەلەکردنو ئازاری ویژدان، خۆمو ئەوانیترم ئازارنەدا، ئەگەر جارێکی تر بۆ کڕینو دەسکەوت یان بۆکارێکی تر بچم بۆ ئەو جێگەیە، ئەوا ئەو دۆستانە منیان پێ قەبوولەو زۆر خۆشحاڵو ئاسودە دەبم، چونکە لە سەفەری پێشومدا پەلەپڕوزێم نەبووەو ئەوانیشم لە خۆم نەڕەنجاندووە، بەهەرحاڵ با ئارامت بکەمەوە... ئەی دۆستی من، بە سەرزەنشتکردن خۆت ئازار مەدە، ئەگەر ڕۆژێک هاتوو سیدهارتات بینی زیانت پێ دەگەیەنێت تەنها یەک قسە بکەو بەس، ئیتر سیدهارتا بە ڕێگای خۆیدا دەڕوات، بەڵام تا ئەو شوێنە با دۆستی یەکبین.

پیاوە بازرگانەکە هەوڵیدا قەناعەت بە سیدهارتا بکات کە لەسەر سفرەکەی بازرگان نان بخوات، بەڵام ئەم هەوڵەشی بێهودە بوو، چونکە هەمیشە سیدهارتا لەسەر سفرەی خۆی نانی دەخوارد، بەدەر لەمەش هەمووان نانی ئەوانیتریان دەخوارد، نانی هەمووانیان دەخوارد، سیدهارتا هیچ کاتێک بیری لە غەمەکانی کاماسڤاتی نەدەکردەوە ، کاماسڤاتی خەموخەفەتی زۆری هەبوو بەتایبەت لەوکاتانەدا کە ترسی زەرەری هەبوایە لەمامەڵەیەک، یان کاتێک کە برێک کاڵاو کەلوپەلی لەناو دەچوو، یان قەرزارێکی توانای دانەوەی قەرزەکەی نەبوایە، هەموو ئەمانە کاماسڤاتیان غەمبار دەکرد، سیدهارتا هیچ کاتێک نەیدەتوانی هاوکارانی خۆی قەناعەت پێبکات کە قسەی زبرو دەمامکردنو خراپ خەوتن هیچ بەروبوومێکی نیە، کاتێک کاماسڤاتی دڵنیای کردەوە لەوەی کە لە سیدهارتاوە فێری هەموو شتەکان بووە، ئەویش لە وەڵامدا وتی: ئەم جۆرە گاڵتەیە مەکە... من لەتۆوە فێربووم کە بزانم نرخی زەمبیلەیەک ماسی چەندە؟ بەقەرزدانی پارەش چەند سودو قازانجی هەیە؟ ئەمانە هەموویان





زانیارین لای تۆ، بەڵام لەتۆوە ئەوە فێرنەبووم کە چۆن بیربکەمەوە ئەی کاماسڤاتی ئازیز، باشترە تۆش لە منەوە ئەوە فێربیت.

دڵنیابوو کە سیدهارتا دڵی لای بازرگانی نەبوو، ئەو کارەشی تا ئەو شوێنەو ئەوەندە بە باش دەزانی کەبتوانێت پارەیەک بۆ کەماڵە پەیدابکات، دەرامەتی زیاتربوو لە پێداویستیەکانی، گەڕانو پشکنینو هەستەکانی سیدهارتا هەمووی تێڕامان بوو لە کارو گرفتارییو چێژو نەزانی خەڵک، ئەو خەڵکانەی کە چەند لەمانگەوە دووربوون، زیاد لەوە لە سیدهارتاوە دووربوون، گەرچی لەناو ئارەزوەکانیاندا دەژیاو گفتوگۆی لەگەڵدا دەکردنو شتێکیان لێوە فێردەبوو، زۆر ئاسان دەیخستنە ڕیزی خۆیەوە، لەهەمان کاتیشدا لەسەر ئەو خاڵە وەستابوو کە شتێک هەیە لە هەموو ئەوانیتری جیادەکاتەوە، بۆیە ئەو نهێنیەشی دەزانی سەردەمانێک سامانا بووە، تەماشایدەکرد خەڵکی یان وەکو مناڵ یان وەکو جانەوەر دەژین، لەم دوو جۆرە ژیانکردنەدا یەکێکیانی خۆشدەویستو نەفرەتی لەویتریان دەکرد، دەیبینی خەڵکی چەند زەحمەت دەکێشنو چۆن لە پێناوی شتگەلێکی کەمو بچوکدا هیلاکنو تێدەکۆشن، بەڵام بەڕاستی لای ئەو هیچ بەهایەکیان نیە، یان لە پێناوی پارەو چێژی بچوکو شانازی بێ نرخدا غەمباردەبنو دووچاری ڕقو کینە دەبن، لەوانە ڕادەما کە چۆن سەنگەریان لەیەک دەگرتو لە یەکتریان دەدا، دەیبینی بۆ ئەو شتانە لە شینو زاریدانو غەمبارو نیگەرانن کە لای سامانا‌کانی دارستان جێگەی پێکەنینە، دەیبینی لە پێناوی ئەو تابۆو حەرامکراوانەدا هەوڵدەدەنو ماندوودەبن کە ساماناکانی دارستان هەست بە بوونی ناکەن.

هەموو جۆرە خەڵکێکی قەبووڵ بوو، کاتێک دەهاتن بۆ لای، ئەو بازرگانانەی کوتاڵیان دەهێنا بۆ فرۆشتن، یاخود ئەو قەرزارەی کە بۆ

قەرزی زیاتر دەهاتە لای، یاخود ئەو سواڵکەرەی کە کاتی لێدەگرتو باسی ماڵوحاڵی خۆیدەکردو لەهەمانکاتدا لە زۆربەی ساماناکانی دارستان دەوڵەمەندتر بوو، بەهاتنیان خۆشحاڵی خۆی دەردەبڕی، سیدهارتا لەگەڵ بازرگانە دەوڵەمەندەکانی دەرەوەدا، یاخود خزمەتکارێک کە خزمەتی دەکرد، یا فرۆشیارێکی گەڕۆک کە بۆ فرۆشتنی مۆزو وەرگرتنی چەند سکەیەک دەهات بۆ لای، لەگەڵ هەموویاندا بەیەک جۆر ڕەفتاری دەکرد، هەرکاتێکیش کاماسڤاتی دەهاتە لای، بەتایبەت کە بۆ مامەڵەکردنەکانی سەرزەنشتی دەکرد، بەو پەڕی سەرنجو وردبینیەوە گوێی لێدەگرتو لەقسەکانی سەری سوڕدەماو هەوڵیدەدا تاوەکو لەمەبەستی تێبگات، لەو شوێنەدا کە دەبوو تەسلیمی بێت، کەمێک ئارامتر دەبوو، پاشان ڕووی لێ وەردەگێڕاو دەچووە لای ئەو کەسەی کە چاوەڕێی دەکرد، خەڵکانێکی زۆر دەهاتن بۆ لای، زۆربەیان بەکاری بازرگانیو بڕێکی تر بۆ فریودانی کۆدەبونەوە، کۆمەڵێک بۆ گوێگرتنو هەندێک لەبەر سەرنجڕاکێشانی بەزەییومیهرەبانیو دڵسۆزیو هەندێکی تر بۆئەوەی پەندو ئامۆژگاریەکانی ببیستن دەورەیان دەداو کۆدەبونەوە. سیدهارتا ئامۆژگاری هەموویانی دەکردو خۆشەویستیو دڵسۆزی دەردەخست بۆیانو دیاری پێدەبەخشین، ئەو دەرفەتی بۆ دەکردنەوە کەتا ئەندازەیەک فریوی بدەن، بیرکردنەوەکانی بەو سەر گەرمیو یاریانەی خەڵکیەوە سەرقاڵ دەکرد، بەهەمان ئەو شێوەیەی پێشتر سەرنجیدەدا کە بیرکردنەوەی سەرقاڵ بوو بە خوداکانەوە.

هەندێ کات لەناخی خۆیەوە ئاوازێکی دەبیست کە بە ئارامی بۆ لای خۆی بانگی دەکردو شتێکی وەبیردەهێنایەوەو بە هێمنی گلەیی لێدەکرد، بەڵام ئەم ئاوازە ئەوەندە لاوازو هێواش بوو کە بە زەحمەت





دەبیسترا، کاتێک سەرنجیدا کە لە ژیانێکی سەیرو سەمەرەدا تەمەنی دەگوزەرێو خۆی سەرقاڵی ئەو کارو فرمانانە کردووە کە جگە لە یارییەک شتێکی تر نەبوون، تەنانەت سەیریکرد بە تەواوی خۆشحاڵو ڕازی بووەو هەندێ جاریش لە چێژو ئارەزوەکاندا بەشدار دەبێتو ئەو ژیانە ڕاستەقینەیە کە تێیکەوتبوو ئێستها بەریناکەوێت، وەک یاریچییەک چۆن بە تۆپەکەی یاریدەکات، ئەویش هەروا لەگەڵ بازرگانیو لەگەڵ خەڵکی چواردەوری خۆی سەرقاڵی یاریکردن بوو، ئەوانەی دەبینیو دڵخۆشی خۆی لە کارەکانیاندا دەردەبڕی، بەڵام لە ناخو دڵی خۆیدا لەوێ نەبوو، سروشتی ڕاستەقینەی خۆی لەگەڵ ئەواندا نەبوو، کەسایەتی ڕاستەقینەی ئەو بە بێ ئەوەی دەربکەوێ لەشوێنە دووردەستەکانو لە جێگەیتردا عەوداڵو سەرگەردان بوو، پەیوەندی بە ژیانی واقعیو ئەزمونی ئەوەوە نەبوو، زۆرجار سیدهارتا لەم جۆرە بیرکردنەوەیە دەترساو خوازیار بوو لە کاری ڕۆژانەو منداڵانەی خەڵکدا بەڕاستیو بەگڕوتینەوە بە تەواوی بەشداری بکات، بەڕاستی لەگەڵ خەڵکیدا بێتو چێژ لەو ژیانەی وەرگرێت کە لەگەڵ ئەواندا بەسەری دەبات، نەک وەکو نامۆیەک لەناویاندا وەک تەماشاچی دابنیشێت، بەڕێکو پێکی ژوانەکانی بەردەوام بوون لەگەڵ کەمالەدا، هەروەها هونەری عەشق فێربوو کە زیاد لەهەموو شتێکیتر لەو مامەڵەیەدا لەیەکدەچوو. گفتوگۆی لەگەڵ کەمالەدا دەکردو شتی لێوە فێردەبوو، پەندی پێدەبەخشێو پەندی لێ وەردەگرت، کەمالە لە گۆڤیندا باشتر لێی تێدەگەشتو هەستی پێدەکرد، کەمالەی زۆر نزیک لە شێوەی خۆیدا دەبینی، ڕۆژێک بە کەمالەی وت: تۆ لەمن دەچیو جیاوازی لەوانیتر، تۆ کەمالەیت، نابیت بە هیچ شتێکیتر، تۆ لە پەناگاکانی ناخی خۆتدا ئاسودەییەک شک

دەبەیتو هەموو کاتێک دەتوانی پەنای بۆ بەریتو ببیت بە خۆت، دروست وەک من، بەڵام خەڵکی زۆر کەم ئەم حاڵەتەیان هەیە، لە کاتێکدا کە هەمووان دەتوانن خاوەنی ئەوەبن.

کەماله لە وەڵامدا وتی: ئاخر خەڵکی هەموویان هۆشیارو زیرەک نین.

سیدهارتا وتی، نەخێر، ئەمە هەرگیز پەیوەندی بە زیرەکیو هۆشیاریەوە نیە، کاماسڤاتی بە ئەندازەی منو تۆ وشیارو زیرەکە، بەڵام لەهەمانکاتدا خاوەنی ئەو پەناگا ناوەکیە نیە، خەڵکی زیاتر لەگەڵای وەریو دەچن، کەلە ساتەوەختی وەریندا لە درەخت جیادەبنەوەو دەسوڕێنەوە، بەهەر لایەکدا بجولێن دواجار دەکەونە سەر زەوی، بەڵام ئەوانە کە وەکو ئەستێرەکان لە خولگەیەکی دیاریکراودا لە سوڕانەوەدابن، زۆر زیاترنو "با"یەکیان ناگاتێ و ڕێگاو ڕێنماییان لە ناخی خۆیاندایە، لەناو زۆربەی ئەو حەکیمانەدا کە من بیستومن، تەنها یەک کەس لەم کارانەدا کامڵ بووەو هەرگیزاو هەرگیز ناتوانم فەرامۆشی بکەم، ئەویش گۆتامای حەکیمە، کە پەندو ئامۆژگاریەکانی لەهەموو جێگایەکدا دەڵێتەوەو بەهەزاران خەڵکی پیرو جوان، هەموو ڕۆژێک ئەو پەندو ئامۆژگاریانە دەبیستن، هەموو سەعاتێک بەو پەندو ئامۆژگاریانە ڕەفتار دەکەن، بەڵام ئەوانە هەموویان لە گەڵای وەریوی دارەکان دەچن، چونکە لەناخی خۆیاندا هیچ حیکمەتو ڕێبەرێک شک نابەن.

کەماله سەیرێکی کردو بە زەردەخەنەیەکەوە پێیوت: دووبارە تۆ دەربارەی ئەو قسە دەکەی، جارێکی تر بیرو بۆچونی ساماناکان هێرشیان بۆ هێنایەتەوە، سیدهارتا بێدەنگ بوو، پاشان دەستیان کرد بە یاریو عەشقبازی، سەرقاڵی یەکێک لەو سی چل یاریە





جۆراوجۆرە جیاوازانە بوو، کە کەمالە دەیزانی، جەستەی ئەو وەک جەستەی پڵنگێک یان کەوانێک نەرمو شێدار بوو، ئەوەی کە وانەی عەشقی لێوە فێر دەبوو، چێژو نهێنیەکی زۆر فێر دەبوو، ئەو ماوەیەکی زۆر لەگەڵ سیدهارتادا یاری کردوو دوایی خستیە لاوە، دۆشداماو شکست خواردووی کرد، لە مامۆستایەکەی خۆی چێژی وەرگرت، تا کاتێک کە بە تەواوی دیلو ماندو شەکەت لە پەنایدا کەوت، ئەوسا ئەو سۆزانیە جوانە خۆی لە جەستەی ئالاندو ماوەیەکی زۆر لە ڕوخساری ڕوانیو لە چاوە ماندوەکانیدا نوقم بوو، کەماله پێی وت: تۆ باشترین مەعشوقێکی لەوانەی کە تا ئیستا من هەم بوویێ، تۆ لەوانیتر بەهێزترو نەرمترو گەرمو گوڕتری، زۆربەباشی هونەرەکەی من فێربووی، ئەی سیدهارتا.. ڕۆژانێ کە من پیربووم، سکم پڕ دەبێ لەتۆ، بەڵام ئازیزەکەم تۆ هەر بە سامانا ماویتەتەوە، هەروەها بەڕاستی منت خۆش ناوێت، لەبەر ئەوەیە کە هیچ کەسێکت خۆشناوێ، ئایا ئەمە ڕاستە؟

سیدهارتا بە ماندووبونێکەوە وتی: لەوانەیە منیش وەکو تۆ بم تۆش ناتوانی کەسێکت خۆشبوێ، ئەگەرنا چۆن دەتوانی وەک هونەرێک عەشق ئەزمون بکەن؟ لەوانەیە خەڵکی بتوانن وەک ئێمە دۆستایەتی بکەن، خەڵکانی سادەش توانای خۆشەویستییان هەیەو دەیانەوێت، ئەمەش نهێنی ژیانی ئەوانە.

***

# سانسارا

ڕۆژگارێکی دوورودرێژ سیدهارتا لە دنیای خەڵکیدا ژیاو بێ ئەوەی پەیوەندی هەبێت بەو دنیایەوە، ئەو هەستو سۆزەی کە سیدهارتا بە درێژایی ساڵانی گەرمو گوڕی خەڵوەتکێشان لەناوی بردبوو، جارێکیتر زیندوو بووەوە، مەزەی زۆری سەروەتو شەهوەتو دەسەڵاتی چەشتبوو، بەڵام ساردەمەنییەکی دوورو درێژ لەناخو دڵەوە وەک سامانایەک مابووەوە. کە ماڵەی زیرەک ئاگاداری ئەو نهێنییەی بوو، ژیانی سیدهارتا هەمیشە بە سەبرو بیرکردنەوەو ڕۆژوگرتنو چاوەڕوانی دەگوزەرا، هەموو مانگێک خەڵکی ئەو دنیایە، واتە خەڵکانی سادە، نامۆبوون بەو، هەروەک چۆن ئەمیش نامۆبوو بەوان.

ڕۆژگار تێپەڕی، سیدهارتا کەوتبووە ناو بەرگی کۆمەڵە ڕێکەوتنێکی باشو ئاسودەو خۆشگوزەرانەوە، بەزەحمەت ئاگای لەرۆژانی رابردوو مابوو، بەو شێوە دەوڵەمەند بوو کە ماوەیەک بوو خانوی خۆیو خزمەتکاری خۆی هەبوو، لە قەراغی شارو قەراغی روبارێکدا باخێکی کڕی بوو، هەموو خەڵک خوشیان دەویست، هەموو کاتێک کە حەزیان لە پارە یان لە پەندو ئامۆژگاری بکردایە، ڕوویان تێدەکرد، بەڵام جگە لە کەماڵە دۆستێکیتری نەبوو.

ئەو ساتانەی وشیاریو بەخۆداهاتنەوە کە ڕۆژگارێکی دێرینو لە لاویەتیدا، تێیدا بەهرەمەندبوو بوو، ئەو ساتەوەختەی کە پاش





بیستنی ئامۆژگارییەکانی گۆتاما بەسەری بردبوو، جیابونەوەی لە گۆڤیندا، ئەو چاوەڕوانیە گەورەیە، ئەو غرورەی بێ مامۆستاییو فێربوون، ئەو ئامادەگیە پڕجۆشو خرۆشو هەڵچونەی بۆ بیستنی سروشی ئاسمانی، هەمووی لە دڵدا بوو بە بیرەوەریەکو هێدی هێدی تێپەڕی، ئەو کانیە پیرۆزەی کە سەردەمانێک لەناخیدابوو،و گۆرانی بۆ دەوتو لەمەودایەکی زۆر دورەوە دەنگی دەهات، بەڵام ئەو شتە زۆرانەی کە لە سەردەمی بوون بە سامانادا لای گۆتامای حەکیمو لای باوکو بەراهماکان فێری ببوو، وەک پەیوەست بوونی بە ژیانێکی سادەوە، چێژەکانی بیرکردنەوە، چرکە ساتەکانی تیرامان، نهێنی شاراوەی دەروون، ئەو دەروونە جاویدانیەی کە نە لە جەستەو نە لە هەستەکاندا جێگەی دەبوەوە، تا ماوەیەک هەموویانی دەپاراست لەناو خۆیدا، بەڵام ئەوانیتر هەموویان تەپوتۆزو خۆڵەمێش دایپۆشین.

بەشێوەی سوڕانەوەی گۆزەی گۆزەسازێک، کاتێ کەدەیسوڕێنێ، دەسوڕایەوەو تاوەکو ڕەفتاری ئاسایی بێتەوەو لەسوڕانەوە بوەستێت، بەو جۆرەش سوڕی خەڵوەتکێشان، سوڕی بیرکردنەوە، سوڕی پاکبونەوە، ماوەیەکی زۆر لە ڕۆحی سیدهارتادا دەسوڕایەوە، بەڵام چیتر ئەو سوڕانەوە هێواش بوەوەو نزیک کەوتەوە لە وەستان، وەک شەونمێک کە لەسەر لقی درەختێکی مردوو بوەستێتەوەو بە هێمنی دزە بکاتە ناو درزەکانیەوەو لەناویبەرێت، بەوجۆرەش جیهانو بێدەنگی چووبووە ڕۆحی سیدهارتاوەو بە هێمنی ڕۆحیان پڕکردبوو، ئەوەش سەنگینو هیلاکی کردبوو،و خستبوویە خەونێکی قوڵەوە، بەڵام لەلایەکی ترەوە لە هەستەکانیدا زیاتر بە ئاگاهاتبوو شتگەلێکی زۆر فێربوو لەڕێگەی ئەزمونکردنەوە، سیدهارتا فێری ئەوە ببوو کە

چۆن بازرگانی بکاتو چۆن هێزو توانای خۆی زاڵبکات بەسەر خەڵکیدا، چۆن چێژ لە ئافرەتەکان وەربگرێت، ئەوە فێرببوو کە جلو بەرگی نایاب بپۆشێتو فەرمان بەسەر خزمەتکارەکانیدا بداتو لەئاوە عەتراویەکاندا خۆی بشوات، فێرببوو چۆن خواردنە خۆشو شیرینیەکانو جۆری حەڵواکان بگۆڕێتو گۆشتو ماسیو باڵداری هەمەجۆر بەکاربهێنێت لەناو خواردنەکانیدا. بەهاراتو داودەرمانە بەتامەکان بەکاربهێنێت، ئەو شەرابە بنۆشێت کە تەمەڵو فەرامۆشکاری دەکات، فێری ئەوەببوو چۆن یاری دامەو شەترەنج بکاتو سەیری ژنە سەماکەرەکان بکات، چیتر بە گالیسکە دەگەڕاو لەسەر پێخەفە نەرمەکان دەخەوت، بەڵام هەمیشە هەستی بەوە دەکرد کە جیاوازییەکی هەیە لەگەڵ ئەوانیترداو لەوان مەزنترەو پەیوەندیشی بەوانەوە لە ئاستێکی نزمدایە،و بەچاوێکی سوکو گاڵتەجاڕانەوە تەماشای دەکردن، وەک ئەو جۆرە تەماشاکردنە سوکەی کە سامانەکانی دارستان هەیانە بۆ خەڵک، ئەم هەستی خۆبەگەورە زانینو گاڵتەکردنەش بە تێپەڕینی کات ڕووەو ئاوابوون دەچوو، بەوشێوەیە وردە وردە سەروەتەکەی ڕوو لەزیادبوون بوو، ئەویش خوو نەریتی منالاَنەو جۆشو خرۆشی خەڵکانی سادەی بە هەند وەردەگرت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئیرەیی پێدەبردن، ئەو لەپێناو چێژێکی قوڵدا حەسودی بەو غەمو شادیو هێزە بەردەوامە دەبرد کە خەڵکی هەیانبوو بۆ خۆشویستن، هەموو ئەو خەڵکانەش پێکەوەو لەگەڵ یەکدا عەشقی بەردەوامیان هەبوو بۆ منالەکانیانو بۆ شانازیو سەروەتو ئارەزوو ئومێدەکانیان، بەڵام سیدهارتا ئەو شتانە لەوانەوە فێرنەببوو کە هەموویان چێژو نیگەرانی منالانە بوون، بەڵکو تەنها ئەو





شتە ناپەسەندانە لەوانەوە فێرببوو کە خۆی نەفرەتی لێکردبوون.

چەند زوو زوو ئەوە ڕووی دەدا، هەرکە شەوێکی لەناو چێژو خۆشیدا بەسەردەبرد، پاش ئەوە چەند سەعاتێکی دوورو درێژ لەسەر چرپاکەی دەمایەوەو خەوی لێنەدەکەوت، بەیانی زوو هەستی بە ماندویەتیو بەدبەختی دەکرد، کاماسڤاتی ئەوی لەگەڵ گرفتاریەکانیدا نائارامو دڵتەنگ دەبینی، هەرکاتێک لە یاری دامەدا بدۆڕایە بە دەنگی بەرز پێدەکەنی، گەرچی ڕووخساری لە ڕووخساری ئەوانیتر هۆشیارترو حەکیمانەتر بوو، بەڵام لە ڕوخساری ئەویشدا حاڵەتێک هەبوو کە بە زۆری لە ڕووخساری دەوڵەمەندەکاندا دەبینرا، واتە حاڵەتی ونبوونی ئارامیو بێزاریو دڵەڕاوکێو تەمەڵیو نەبوونی عەشق، نەخۆشیە ڕۆحیو دەروونیەکانی خەڵکی دەوڵەمەند بە هێمنی لە ڕۆحی ئەویشدا هێلانەی کردبوو.

بێزاری وەک چەترێک یان وەک پەردەیەکی نازکو پەڵە هەورێک، کە هەموو ڕۆژێک پیرترو هەموو مانگێک ڕەشترو هەموو ساڵێک قورستر بێت، ئاسمانی سەری داگیرکردبوو. وەک جلو بەرگێک کە هەموو ڕۆژێک کۆنتر دەرکەوتبێتو درەوشانەوەی ڕەنگە جوانو ئەفسوناویەکەی لە دەست بدات، هەروەها ئالۆزکابوو درزەکانی، بەو جۆرەش ئەو ژیانە تازەیەی لە دوای جیابوونەوەی لە گۆڤیندا دەستی پێکردبوو، تاریکو سواو شێواو لێک ترازابوو، بەو شێوەیە بە تێپەڕینی ڕۆژەکان ڕەنگو شەفافیەتی لەناو دەچوو، چین چین تاریکیو بەدبەختی شوێنی ئەوەی دەگرتەوە، نائومێدیو نەفرەت کە لە هەموو جێگەیەکیدا پەراگەندەو لە قوڵایی ڕۆحیدا پەنهانبوو، وردە وردە دەردەکەوتەوە. سیدهارتا ئەوەی نەدەبینی، تەنها دەیزانی ئەو

ئاوازە ساف‌و بێگەردەی کە ڕۆژگارێک لە دڵیەوە دەگەشتەگوێی‌و هەمیشە لە باشترین چرکە ساتەکانیدا ڕێنمایی دەکرد، چیتر خامۆش بووە.

جیهان داگیریکرد بوو، چێژەکان، تەماحی دنیا، تەمەڵی‌و تەماحی ماڵ‌و پارە کۆکردنەوە، لە هەمووشیان گرنگتر عەیبەکانی تری بوون کە لە هەموویان زیاتر نەفرەتی لێدەکردو ناشیرینی دەکرد، سەراپا داگیریان کرد. سەروەت‌و ماڵ‌و پارەو پول دواجار خستیانە داوەوە، ئەمانە چیتر یاری‌و یارۆچکەیەک نەبوون، بەڵکو ئەو زنجیرانە بوون کە کرابوونەوە. سیدهارتا لەم ڕێگە ئاڵۆزو لاتاریکەدا سەرگەردان بوو، بە ناشیرینترین‌و بێ ماناترین ئەو کارانە ڕووخاو خۆی دۆڕاند کە قوماربوو، چیتر ئەو ساتانە لە دڵەوە سامانا نەبوو، بەڵکو لە پێناوی پارەو خشڵی گرانبەهادا بە ئیرەییەکی زۆرەوە زاری قوماری لەلا گرنگتربوو، پێشتر گەر بەشداری قوماری بکردایە لەبەر خوونەریتی خەڵکی دەوروبەری بوو، بەڵام ئەو قوماربازێکی کارامەو لێهاتووی لێدەرچووبوو، ژمارەیەکی زۆر قوماربازی لەگەڵدابوو، مەرج‌و بەستنەکانی لە قوماردا ئێجگار قورس‌و ترسناک بوون، لە پێناو پێداویستیەکانیدا لەناو جەرگەی قومارباز‌اندا یاریدەکرد، لەناخی خۆیدا هەستی بە شەهوەت‌و چێژێکی سەیردەکرد بۆ دۆڕاندنی پارەی پیس لەڕێگەی قومارەوە، لە هیچ ڕێگایەکی باشترەوە نەیدەتوانی نەفرەتی خۆی لە دەوڵەمەندەکان‌و ڕێزگرتنی درۆزنانەی بازرگانەکان بخاتەڕوو و بیباتە سەر میمبەری قسەکردن، بەوشێوەیە گەورەو ترسناک مەرجەکانی قوماری دەکرد، نەفرەتی لە خۆی دەکردو گاڵتەی بە خۆی دەکرد، بە هەزاران دەیبردەوەو بە هەزارانیش





دەیدۆڕاند، پارەی دانراوی هەموو دۆڕاند، خشڵ‌و گەوهەرەکانی دۆڕاند، ماڵ‌و باغی دۆڕاندو جارێکی تر بردیەوە، دیسانەوە دۆڕاندی، چێژی لەو جۆش‌و خرۆشە وەردەگرت کە لەکاتی مەرج بەستەکانی یاری زار زۆریدا دەیبینی، ئەم جۆرە هەستەی خۆشدەویست‌و هەوڵیدەدا سەرلەنوێ بە دەستی بهێنێتەوەو زیاتری بکات‌و جۆش‌و خرۆشی پێببەخشێتەوە. تەنها لەم کاتانەدا بوو، کە کەمێک هەستی بە حەوانەوەو ئارامی دەکردو چێژی وەردەگرت. بەوشێوەیە دەیویست شەوق‌و دڵخۆشیەک ببەخشێت بەو ژیانە تاریک‌و بێ چێژو داڕووخاوەی خۆی، پاش هەر دۆڕانێک سەرلەنوێ خۆی ئامادە دەکردەوە بۆ کۆکردنەوەی پارەو ماڵ، بەسەختی خەریکی کاری بازرگانی بوو، بۆئەوەی پارەیەکی کاشی لە دەستدا بێت‌و پاشان بیخاتە لاوەو قەرزارەکان لە وەرگرتنەوەی قەرزەکەیدا بخاتە ژێر فشارەوە، دەیویست نەفرەت‌و بێ نرخی خۆی بەرامبەر سەروەت‌و سامان نیشانبدات. لەوکاتەدا کە دەدۆڕا نائارام‌و نیگەران دەبوو، سەبرو هێمنی خۆی بەرامبەر بەو قەرزارانە لە دەست دەدا کە درەنگ قەرزەکانیان دەدەنەوە، چیتر خاوەنی بەزەیی نەبوو بەرامبەر هەژاران، مەیل‌و ئارەزووی ئەوەی نەمابوو دیاری یان قەرزبدات بە وانەی کە پێیان ڕەوایە. ئەو بە فڕێدانی زارێک بەستنی لەسەر دەیان هەزار دەکردو پێدەکەنی، زۆر زیاتر لە پێشوتر گەرم‌و گوڕتر دەبوو لە کاروباری بازرگانیدا، هەندێک کات تەنانەت شەوانەش خەوی بە پارەوە دەبینی‌و بەدەم ئەو کابووسە ترسناکەوە خەبەری دەبووەوە، ڕوخساری خۆی لە ئاوێنەی ژوری نوستنەکەدا دەبینی کە چۆن پیرترو ناشیرینتربووە، کاتێ کە نەفرەت‌و شەرم بەسەریدا زاڵدەبوو،

پەنای بۆ یارییەکی تری قومار دەبردو خۆیدەدایە دەست ئاشوفتەیی شەهوەتو شەراب، جارێکی تر لەو حاڵەتە دەهاتەوە تاوەکو بتوانێت هێرش بۆ ماڵو سەروەتێکی زیاتر بەرێتو بیخاتە ناو چنگی خۆیەوە، بەوشێوە رێچکە بێ مانایەی ژیان، خوی لەناوبردبوو.. خۆی پیرو کە نەفت کردبوو.

لەو ساتانەدا خەونێک هێنایەوە سەرخۆی، شەوێک لە باغە بەهەشت ئاساکەی کەمالەدا پێکەوە دانیشتبوون، لە ژێر درەختێکدا ئارامی گرتبوو لەگەڵ کەمالەدا قسەیدەکرد. کەمالە زۆر جدی بوو، غەمو زەحمەت لە پشتی پەردەی وشەکانیەوە پەنهان بوو، کەمالە دەربارەی گۆتاما پرسیاری لێدەکرد، بەڵام چیتر لەو شیرینڕەفتارو چاوبازو دەم شەکرو زەردەخەنە شیرینەوە شتێکی نەدەبیست.

ماوەیەکی زۆر کەمالە دەربارەی بودای مەزن قسەیکردو پاشان ئاخێکی هەڵکێشاو وتی: ڕۆژێک دەبمە موریدی بوداو ئەم باغی چێژو ئارامیەی پێشکەش دەکەم، خۆم دەکەمە باوەڕدارێکو لە پەنای وانەو ئامۆژگاریەکانیدا دەمێنمەوە.

پاشان بە جۆشو خرۆشێکی زۆرەوە سیدهارتای بانگ کردە لای خۆیەوە، لە کاتی عەشقبازیدا بە کەفو کوڵو هەڵچونێکی زۆرەوە نزیکی کردەوە لەخۆی، وەک ئەوەی بیەوێت دواهەمین تنۆکە شیرینەکانی لەزەت بنۆشێت، سیدهارتا هیچ کاتێک بەم ئەندازە زۆر ڕوونو ئاشکرایە هەستی بە نزیکی شەهوەتو مەرگ نەکردبوو. پاشان لە پەنای کەمالەدا ئارامی گرت، ڕوومەتی لە ڕوومەتی کەمالەوە نزیکبوو، لە کەنار چاوو لێوەکانیەوە خەتە چین چینو نازکو جوانەکانی بەدیکردو نیشانەکانی غەمباری بینی کە خەزانی





ژیانیان دەنواند. سیدهارتا خۆشی لە تەمەنی چل ساڵیدا بوو، مووەکانی ڕەنگی خۆڵەمێشیان لێنیشتبوو، لەسەر ڕووخسارە جوانەکەی کەمالە لۆچەکانی پیریو کەنەفتی کێشرابوون. ئەو چرچو لۆچی کەنەفتیو پیریە، لە بەردەوامی تەیکردنی ڕێگای ناشیریندا، لە کەنەفتی پیریو کەوتنە سەرزەوی، کەنەفت بوون لە شتێک کە هەمیشە پەنهان بوو، ترس، ترس بوو لە خەزانی ژیان، ترس بوو لە پیریو ترس بوو لە مەرگ، لەوکاتەدا ئاخی هەڵدەکێشاو لێی جیابووەوەو دڵی بە غەمو زەحمەتو ترسێکی نهێنیئامێز گوشرابوو.

سیدهارتا ئەو شەوەی لە ماڵەکەی خۆیداو لەگەڵ ئافرەتە سەماکەرەکاندا بە شەرابخواردنەوە بردە سەر، وا خۆی دەردەخست کە لە هاونشینەکانی خۆی مەزنترە. لەکاتێکدا کە ئەو مەزنیو گەورەییە چیتر لەودا بوونی نەبوو، شەرابێکی زۆری نۆشیو پاشان نیوەشەو ماندوو، ئازار چەشتوو، بێزارو نائومێد، لەکاتی فرمێسک ڕشتنابوو، ڕۆشتەوە سەر چرپاکەی. بێهودە هەوڵیدا خەوی لێبکەوێت، بەوشێوەیە پڕبوو لە زەحمەتو ماندویەتیو ئازار، چیتر دڵیشی تینی ئەوەی نەمابوو لێبدات، خۆی لە نغرۆبوونی نەفرەتدا بینیەوە، ئەو نەفرەتە وەک مەزەی نۆشینی شەرابێکی بەد، یان بیستنی ئاوازێکی زۆر شیرینو سادە، یان زەردەخەنەی ژنانی سەماکەر، یان وەک ئەو عەترە بۆنخۆشە بوو کە لە سینەو مووەکانیانەوە دەگەشتە لووتو گەروو، بەڵام زیاد لە هەموو شتێک نەفرەتی لە خۆیدەکرد، ئینجا لەو عەترەی کە ڕژابوو بەسەریدا، لە بۆنی ئەو شەرابەی کە لە دەمیەوە هەڵدەستا، لە پێستی نەرمو ناسکی جەستەی، وەک کەسێک کە زۆری خواردبێو خواردبێتەوەو ئەوەی کە خواردوویەتیو نۆشیویەتی،

لەكۆتايى دەردو ئازارەوە بە سەلامەتى بيگەڕێنێتەوە، بە هەمان شێوە ئەو پياوە نا ئارامەش هەوڵيدەدا تاوەكو خۆى بەيەك تەكان لەو هەموو چێژو نەريتە بێمانايەى ژيان ڕزگاربكات، بەڵام نزيكى بەيانى، لەوكاتەدا كە يەكەمين نيشانەى چالاكىو كاركردن لە دەرەوەى ماڵدا بەرگوێ دەكەوێت، توانى چاوانى لێكبنێو چەند ساتێك لە دنياى نيوە فەرامۆشيدابێت، يان خەوى لێبكەوێت، لەوكاتەدا بوو كە خەوێكى بينى، كەماڵە باڵندەيەكى زۆر نايابو بچوكو دەنگ خۆشى هەبوو، لە قەفەزێكى زێڕيندا بوو، ئەو خەونەش دەگەڕايەوە بۆ ئەو باڵندەيەى كە سيدهارتا خەوى بينى: ئەو باڵندەيە كە چەندين بەيانى دەهاتو دەيخوێند، سەرلەنوێ هاتوەتەوەو لە خوێندندا هەروەك خۆى ماوەتەوە، ئەم مەسەلەيە لاى سيدهارتا زۆر سەيرو سەمەرە بوو، لە قەفەسەكە نزيك كەوتەوەو سەيريكرد باڵندەيەكى خنجيلانەى مردوو، وشكەوەبوو لەناو قەفەسەكەدا كەوتووە. پاشان باڵندەكەى لە قەفەسەكە هێنايە دەرێو لەناو دەستەكانيدا كەمێك هێشتيەوەو پاشان فڕێدايە قەراغى ڕێگاكەوە، لەوكاتەدا ترسێكى سەير دايگرت، هەستى بەوەكرد كە بە فڕێدانى ئەو باڵندەيە هەموو ئەو شتانەشى فڕێداوە كە لە پێشچاويدا گرنگو گرانبەها بوون. كاتێك لە خەونەكەى ڕاپەڕى، غەمو نيگەرانيەكى زۆر دڵى گوشيبوو، بە خەياڵيدا هات كە عومرێكى بێ ماناو بێ نرخى گوزەراندوەو شتێكى لەبەر دەستدانيە كە بەهاو نرخو گرنگيەكى بۆ ئەو هەبێت، لەوكاتەدا لە پياوى ئەو كەشتيە شكاوە دەچێت كە لە كەنارى دەريادا بە تەنيا ڕاوەستابێت.

لەوپەڕى غەمو ماندوويەتيدا چوو بۆ ئەو باغەى كە هۆگرى بوو، دەرگاكانى داخستو لە ژێر درەختێكى ئانبەدا دانيشت، لە دڵى خۆيدا





هەستى بە ترسو مەرگ دەكرد، وردە وردە بيركردنەوەكانى پەرێشانو پەرتەوازەبوونو لە دنياى خەياڵو بيركردنەوەدا سەرقاڵى تەماشاكردنى ديمەنە جياوازەكانى سەردەمى ژيانى خۆى بوو، لەيەكەم ڕۆژەوە تا ئەو شوێنەى ئەى توانى بيرى لێبكاتەوە، بەڵام بەڕاستى ئەو كەى خۆشبەخت بووەو چ كاتێك بە ڕاستى لەشادى بەهرەمەند بووە؟ بەڵام چەندين جاريتر بەهرەمەندبووە لە شادىو خۆشبەختى، چێژو مەزەى ئەو خۆشبەختيەى لە سەردەمى مناڵيدا چەشتبوو، ئەوكاتەى كە بە ئامادەگى زەين سەرنجى چاكەى براهماكانى بۆ لاى خۆى ڕادەكێشا، ئەوكاتەى كە لە هاوتەمەنەكانى خۆى لە پێشترو مەزنتربوو، ئەوكاتەى كە لە خوێندنەوەى وتە پيرۆزەكاندا لە سەرووى هەموويانەوە بوو، يان ئەوكاتەى كە لەگەڵ پياوە حەكيمەكاندا گفتوگۆى دەكردو بەشدارى مەراسيمى قوربانيەكانى دەكرد.

لەوكاتەدا لە دڵى خۆيدا بەم شێوەيە هەستيدەكرد: "تۆ ڕێگەيەكت لە پێشەو بانگيان كردووى بۆ تەيكردنى ئەو ڕێگايەو خواكان چاوەڕێى تۆ دەكەن". جارێكيتر سەردەمى لاويى لە خەياڵيدا نەخشێنرا، ئەوكاتەى كە ئومێدە بەرزەفڕەكانى هەردەم ئەويان كێشابووە ناو ئەو شوێنكەوتوانەى كە لە خۆيدەچوون، ئەوكاتەى كە هەوڵيدەدا لە پەندو ئامۆژگارى براهماكان تێبگات، ئەوكاتەى كە لە پێناوى فێربوونى مەعريفەيەكى تازەدا تينوێتيەكى تازەش لە دەروونيدا لە دايكدەبوو، ئەوكاتەى لەناو ئەو تينوێتىو هەوڵوكۆششانەدا زياتر دەچووەوە ناوخۆىو بيرى لە خۆيدەكردەوە، ئەوكاتە زياتر ئەو ئاوەزەى بيست كە بانگى كرد "ئەمەيە ڕێگەى تۆ"

ئەم ئاوازەی کاتێک بیستبوو کە ماڵی باوکی جێهێشتبوو،و چووبووە ناو ساماناکانەوە، جارێکی تر ئەوکاتە بوو کە لە پێناوی دیدەنی بوودا، ئەو پیاوە تاقانەو کامڵەدا ئەو ژیانەی جێهێشتبوو، هەروەها ئەوکاتەش ئەو ئاوازەی جارێکیتر بیستبوو کە لە پێناوی چارەنووسی نادیاری خۆیدا بوداشی جێهێشتبوو.

ئەمە دواجاربوو کە ئەو ئاوازەی بیستو بۆ بەدەستهێنانی شوێنە مەزنو دوردەستەکان کەوتبووە فڕین، رۆژگارێکی دوورو درێژ تێدەپەڕیو ئەو ڕێگایە چەند بەردەوامو خاڵی بوو؟ چ ساڵانێکی دوورو درێژی ئاوا ژیابوو بەبێ تینوێتیو بەبێ بوونی ئامانجێکی مەزن، بەبێ ستایش، ملکەچی چێژە بچوکەکان بوو کە هیچ کاتێک بەراستی تێریان نەکردبوو، بەبێ ئەوەی خۆی بزانێت، بۆیە ئەو ساڵانەی ئاوا گوزەراند کە وەکو خەڵکانی ترو وەکو منداڵان بێت، لەهەمان کاتیشدا ئومێدو هەوڵو کۆششەکانی وەک ئومێدو هەوڵو کۆششی ئەوان نەبوو، ژیانی ئەو لە ژیانی خەڵک هەژارانەتر بوو، هەموو جیهانو مرۆڤ لای سیدهارتا، وەک کاماسڤاتی، یان یاری بوو، یان سەما، یان نمایشێکی گاڵتەجاڕانە بوو، کە ئەو بەتەماشاکردنیەوە سەرقاڵ ببوو، تەنها کەماڵەی خۆشدەویستو بەهاو نرخی هەبوو لەلای، بەڵام ئەو نرخو بەهایەش بەجۆرێک نەبوو کە رازی بکات، ئایا هێشتا پێویستی بەو هەبوو؟ یان کەماڵە تامەزرۆی ئەوبوو؟ مەگەر ئەوانە سەرگەرمی یارییەکی بێکۆتا نەبوون؟ ئایا بە ڕاستی پێویستە لە پێناوی ئەو یاریەدا زیندوبین؟ نەخێر، ناوی ئەو یاریە "سانسارا"یەو لەو یاریەی منداڵانەیە، ئەو یاریەی کە ئەوانە چێژی لێوەردەگرن، لەوانەیە یەکجار، دووجار، دەجار یاری بکەن، بەڵام ئایا ئەو نرخەی هەیە کە مرۆڤ سەرقاڵی ئەو یاریە بێت؟

سیدهارتا زانی کە یاریەکە تەواوبووە، زانی چیتر توانای بەردەوامبوونی ئەو یاریەی نیە، لەرزێک دڵی گرتو هەستی کرد شتێک لەناویدا مردووە، بە درێژایی ڕۆژ لە ژێر ئەو درەختی ئانیەیەدا دانیشتو بیری باوکیو گۆڤینداو گۆتامای کردەوە، ئایا ئەو ئەمانەی جێهێشتبوو بۆئەوەی ببێتە کاماسڤاتی؟

شەو داهاتو ئەو هەرلەوێ بوو، لەوکاتەدا سەیری ئاسمانو ئەستێرەکانی کردو بیریکردەوە کە من: لێرەدا لە ژێر درەختی ئانبەدا، لە باغی خۆما دانیشتووم.. زەردەخەنەیەک کەوتە سەر لێوانی، بەڵام ئایا ئەمە پێویستو دروست بوو؟ ئایا ئەمە کارێکی منداڵانەو گەمژانە نەبوو کە دەبێت خاوەنی باغو درەختی ئانبە بێت؟ ئەمەشی گەیاندە کۆتاییو ئەمەشی تێدا مرد، هەستایە سەرپێو ماڵئاوایی لە درەختی ئانبەو لە باغەکە کرد. بە درێژایی ئەو ڕۆژە بەبێ خواردن مابووەوە، هەستی بە برسیەتیەکی زۆر کرد، کەوتە بیرکردنەوە لە ماڵەکەی لە شار، ژوری نوستن، چرپای نەرمو سفرە پڕ لە خوانەکەی، بە ماندووبونێکەوە زەردەخەنەیەکی کردو سەری باداو ماڵئاوایشی لە هەموو ئەو شتانە کرد، هەر ئەو شەوە سیدهارتا باغو شاری جێهێشتو چیتر نەگەڕایەوە.

ماوەیەکی دوورو درێژ کاماسڤاتی بە دوایدا گەڕا، پێیوابوو کە سیدهارتا کەوتووەتە چنگی چەتەکانەوەو گرفتاربووە، کەماڵە هیچ هەوڵو کۆششێکی نەدا بەدوای دۆزینەوەیدا، کاتێک کە هەواڵی ونبوونی سیدهارتای بیست، توشی سەرسوڕمان نەبوو، مەگەر ئەو

هەمیشە چاوەڕێی ئەوە نەبوو؟ مەگەر سیدهارتا سامانایەکی بێ ژنو موسافیرێکی هەژار نەبوو؟

چونکە کەمالە لە دواهەمین یەکتربینینو گفتوگۆیاندا، زیاد لەهەموو کاتێکیتر هەستی بەمە کردبوو، بەوپێیە ئەوەندەی کە سیدهارتای لە خۆ گرتبوو، لە خۆیی نزیک کردبوەوە، بەو ئەندازەیەش خستبوویە ژێر ڕکێفی خۆیەوەو سەرکۆنەی کردبوو، هەستی بە دڵخۆشی دەکرد، کاتێک کە هەواڵی ونبوونی سیدهارتای بیست، چووە لای ئەو پەنجەرەی کە لە نزیکەوە ئەو باڵندە دەنگ خۆشەی لێبوو، کە لە قەفەسێکی زێڕیندا دیل کرابوو، قەفەسەکەی کردەوەو باڵندە خنجیلانەکەی بەدەست گرتو پاشان لە هەوای ئازاددا بەرەڵای کرد، چەند ساتێک چاوی بڕیە باڵندەکە، کە بەرەو بەرزایی دەفڕیو خەریک بوو لەچاو وندەبوو، لەو ڕۆژەوە دەرگایماڵەکەی بۆ ئەبەد داخستو چیتر میوانێکی قەبوڵ نەبوو، دوای ماوەیەک پەی بەوەبرد کە لە ئەنجامی دواهەمین عەشقبازی لەگەڵ سیدهارتادا سکی بووە.

***





# کەناری ڕووبار

سیدهارتا ماوەیەکبەسەرگەردانی ڕێگای بڕی لە دارستاندا، زۆر دوور کەوتبوەوە لەشار، بە تەواوی ئەو خاڵەی لەلا ڕوونو ئاشکرا بوو کە چیتر هەرگیز ناتوانێت بگەڕێتەوە بۆ شار، هەروەها دەیزانی ژیانی ساڵانی ڕابردوی سەرتاسەر نەفرەتو نەگبەتی بوو، ئەو باڵندە دەنگ خۆشە مردبوو، مەرگی ئەو باڵندەی کە لەخەونیدا بینی بووی، مەرگی باڵندەی دڵی خۆی بوو، سیدهارتا بە یاری سانسارا ئێجگار گەرمی بوەوە، لەناو نەفرەتو وەستانەوەیەکدا کەلە هەر چوارلاوە گەمارۆدرابێت وەک ئسفەنجێک ئاو هەڵمژێت نوقم بووبوو .

بوونی پڕ ببوو لە بێزاریو وەستانەوە، پڕ لە بێنەواییو پڕ لە مەرگ، چیتر شتێک نەبوو کە بتوانێت سەرنجی ئەو ڕابکێشێت، یان چێژی پێببەخشێتو بیحەوێنێتەوە، ئەویندارانە ئارەزوی فەرامۆشکردنی دەکرد، حەزیدەکرد بحەوێتەوەو بمرێت، ئاواتە حوازبوو بەوەی: خۆزگە هەورە تریشقەیەکی بۆ دەهات، خۆزگە بەورێکی دڕندە هێرشی بۆ دەهێنا، خۆزگە شەرابێک یان ژەهرێک پەیدادەبوو، و فەرامۆشی پێ دەبەخشیو ڕابردوەکانی لەبیردەبردەوەو خەوی لێ دەخستو نەیدەهێشت دووبارە خەبەری بێتەوە، ئایا شتێکی ناپاک هەیە کە ئەو ڕۆحی خۆی پێ گڵاو نەکردبێ؟ ئایا گوناهو تاوانێک هەیە خۆی بۆ ئامادە نەکردبێت؟ هیچ هەڵەو گەمژەییەک لە ڕۆحی ئەودا دەردەکەوێت کە تەنها خۆی لێی

بەرپرس نەبێت؟

ئایا چیتر دەکرا بەردەوامی بە ژیان بدات؟ دەکرا جارێکی تر هەناسەبداتو دەمی بکاتەوەو برسی بێتو جارێکیتر خواردن بخوات ؟، بیەوێت جارێکی تر بخەوێتو دۆستایەتی لەگەڵ ژناندا بکاتو نزیکیان بکەوێت؟، ئەی ئەو ماوەیە بۆ ئەو، مایەی  یلاکیو ماندوبوون نەبوو، ئایا کۆتایی نەهاتبوو؟

سیدهارتا گەیشتە ئەو رووبارە گەورەو فراوانەی کە بەناو دارستانەدا گوزەرە دەکرد، ئەو کاتەی گوَتامای جێهێشتو دوورکەوتەوە هێشتا لاو بوو، جارێکیتر رێکەوتی ئەو شوێنەی کردبوو کە لەناو بەلەمێکدا لەوێوە پەڕیبووەوە، لەسەر رووبارەکە وەستاو بەدوودڵیو نیگەرانیەوە لەو کەنارەدا مایەوە، برسیەتیو تینویەتی لە پێی خستبوو، بۆچی لەمە زیاتر بڕوات؟ بۆ کوێ بچێتو چ مەبەستو مەرامێکی هەبێت؟ چیتر شتێک نەبوو کە مەبەستی ئەو بێتو خوازیاری بێت، جگە لەوەی ئەو مۆتەکە ترسناکەو ئەو شەرابە هێڵنجاویە فڕێبداتو لەخۆیی دووربخاتەوە، ئەو ژیانە پڕ زەحمەتو تەمو مژاویە کوتایی پێبهێنێت مەبەستێکی تری نەبوو.

لە کەناری ئەو رووبارەدا درەختێکی "نارگیل" ی بەدیکردو پاڵی پێوەداو بازوەکانی ئالاند بە قەدی درەختەکەداو سەیری ئەو قولایی ئاوە سەوزباوەی کرد کە لەبەر پێیدا تێدە پەڕی، سەیری خوارەوەی کردوو ویستی خۆی فڕێبداتە ناو ئاوەکەوەو نغرۆبێت، ئەو بۆشایە ترسناکەی لە ئاوەکەدا هەبوو بۆشیای رۆحی سیدهارتای دەردەخستەوە، بەڵێ ئەو بە کۆتایی گەشتبوو، چیتر چارەیەک نەمابوو، جگە لەوەی خۆی لەناوبەرێتو ماڵی پڕ لە نائومێدی خۆی





وێرانبکاتو گاڵتەجاڕانە فڕێبداتە ژێر پێی خوداکانەوە، ئەمە ئەو کارەبوو کە تامەزرۆی ئەنجامدانی بوو، خوازیار بوو ئەو پەیکەرە نەفرەت لێکراوە لەناوبەرێت، دەیویست ماسیەکان ئەو سەگە پارچە پارچە بکەن کەناوی سیدهارتابوو، ئەو پیاوە شێتو دێوانەیە، ئەو پەیکەرە ڕزیوو گەنیوە، ئەو رۆحە سستو تەمەڵو بێ کەڵکە لەتو پەت بکەن، حەزیدەکرد ماسیەکانو تیمساحەکان هەپرون بە هەپرونی بکەن، دەیویست دێوێک بیپروێنێتو وێرانیبکات.

بە ڕوخسارێکی مۆنو ترشاوەوە لە ئاوەکەی ڕوانیو ڕوخساری خۆیی بینی لە ئاوەکەداو پرێکرد لەتف، دەستی لە قەدی درەختەکە وەردا، کەمێک سوڕایەوە تاوەکو  سەرەوژێر بێتەوەو لە رۆحی ئاوەکەدا نوقم بێت، سیدهارتا بە چاوی داخراوەوە عەودالی مەرگ بوو.

لەوکاتەدا لە قولایی رۆحیەوە، لە ژیانی پڕ نەگبەتیو ماندوی ڕابردویەوە، دەنگێکی بیست، ئەو دەنگەش لە وشەیەک زیاتر هیچی تر نەبوو، تەنها پارچە ئاوازێک، کە بە بێ بیرکردنەوەو تێرامان دەریبڕی، ئەو وشەیە هەمان ئەو وشە پیرۆزەبوو کە سەرەتاو کۆتایی دوعای براهماکانی دیاریدەکرد، ئەو وشەیە  "ئوم" ی پیرۆزبوو، کەبە واتای خودا یان تاقانەی کامڵ دەهات، لەو چرگە ساتەدا کە دەنگی  ئوم گەشتە گوێی، لەناکاو رۆحی کوژاوەو دامرکاوی بە ئاگاهاتەوەو رووبەڕوو سەرشێتیەکانی خۆیی بینی کە لە چڵەپۆپەدا بوون.

سیدهارتا بە سەختی ماندوو هەراسان بوو، سەرئەنجام چارەنوسی گەشتبوە ئەو شوێنە، ئەوەندە تەنیاو پەرێشانو گومڕا

ببوو خوازیاری مەرگ بوو،و بە دوایدا دەگەڕا، هەروەها ئەو ئومێدە منالآنەیە ئەوەندە لە ناخیدا گەورە ببوو، کە ئارامیی‌و ئاسودەگی جەستەی وێرانکردبوو، هەموو ئەشکەنجەی ئەو سالآنەی دوای، هەموو ئەو نائومێدیانە، ئەو هەموو گومڕابونە، بە ئەندازەی ئەو چرکەساتە ماندووی نەکردبوو کاریگەر نەبوو کە لە قولآیی ڕۆحی خۆیەوە دەنگی ئوم ی بیستو بەدبەختیی‌و گوناهو تاوانەکانی خۆی ناسی، لەناخەوە بەخۆیی وت: "ئوم "، ئەوسا دەربارەی براهماو نەمری ژیان بەئاگاهاتەوەو، ئەوشتە ئاسمانیانەی وەبیر خۆی هێنایەوە کە لە یادی کردبوو، بەلآم ئەم حاڵەتە تەنها بۆ چرکە ساتێک بوو، سیدهارتا لەناو ماندوویەتیدا لەبن درەختە "نارگیل"ە کەدا دانیشتو لەبەرخۆیەوە وشەی ئوم ی دەوتەوە، سەری خستە سەر ڕیشەی درەختەکەو خەوێکی قوڵ بردیەوە، خەوی ئەو، خەوێکی قوڵی بێ خەون بوو، ماوەیەکی زۆربوو بەو شێوە نەخەوتبوو، کاتێک بەخەبەر هات پێیوابوو سالآنێکی دوورودرێژ تێپەڕیوە، ئاوازێکی دڵفڕێنی لە شەپۆلەکانەوە بیست، نەیدەزانی لە کوێوەو چ شتێک فڕێیداوەتە ئەوێ، سەیری ئاسمانی کردوو سەری سوڕما لە بینینی درەختەکانو ئەسترەکان، پاشان بیری کەوتەوە کە لە کوێوەو چۆن گەشتوەتە ئەوێ، هەستیکرد ئارەزویەکی قوڵی هەیە کە لەو شوێنەدا بمێنێتەوە، ڕابردوو پەردەپۆش کرابوو، لە سیدهارتاوە زۆر دوور بوو،و بەچاوێکی سوکەوە تەماشای دەکرد، بەلآم دەیزانی چیتر ژیانی ڕابردووی کۆتایی هاتووە، لەو چرکە ساتەدا کە بە ئاگاهاتەوە، ژیانی ڕابردوو لە تێڕوانینیدا وەک پوچەڵیەکی ئێجگار دوور، یان وەک سەرەتای دەسپێکردنی ژیانێکی تازە دەردەکەوت، دەیبینی ژیانی





ڕابردوی پڕ لە نەفرەتو بەخۆدا هاتنەوەو بێ نەوایی بووە، دەیویست کۆتایی پێبهێنێت.

بەلآم لە کەناری ڕووباردا، لە ژێر درەختی نارگیل دا، بە وشەی پیرۆزی ئوم بەخۆدا هاتەوە، پاشان خەوی لێ کەوتو لەبە ئاگاهاتنەوەدا وەک کۆرپەیەک کە بۆ یەکەمجار چاوەکانی بکاتەوە تەماشای جیهانی کرد، بەئارامی وشەی ئوم ی بە خۆی وت، سیدهارتا لەگەڵ ئەو وشەیەدا خەوی لێ کەوتبوو، پێی وابوو خەوەکەشی لەوتنی قوڵی ئەم وشە پیرۆزەوە بووە، ئەو لەو وشەیەدا نوقم ببوو، هەروەها حەیرانی ئەم وشەیە بوو،و چوو بووە حاڵەتێکی قوڵی ئاسمانیەوە.

وای چ خەوێکی خۆشو ئارام بوو، پێشتر هیچ خەوێک بەو ئەندازەیە تێر ئاوی نەکردبوو بەو ئەندازەیەش گەنجی نەکردبوەوە، لەوانەیە ئەو بەڕاستی مردبێت، لەوانەیە نوقم بووبێ‌و جارێکی ترو بە شێوەیەکیتر گەڕابوو بێتەوە بۆ جیهان! نەخێر، ئەو خۆی دۆزیەوە، ئەو دەستو پێکانیی‌و ئەو شوێنەشی ناسی کەتێیدا فرێدرابوو، دەورنی خۆیی بینیی‌و لەو سیدهارتایەش تێگەیشت کە لەناو خۆیدا ئیرادەی شکدەبردو سەربەخۆ بوو، بەلآم ئەو سیدهارتایە گۆڕابوو،و تازە ببوەوە، خەوێکی خۆشو ئارامی کردبوو، بە تەواوی خۆشحاڵو بەئاگاو وریاببوەوە.

سیدهارتا لە جێگەی خۆی هەستاو کاهینێکی لەبیرکردنەوەیەکی قوڵدا بینی کە بە عەبایەکی زەعفەرانی ڕەنگو سەرێکی تاشراوەوە لە بەرامبەریدا دانیشتوە، لە جێگەی خۆیەوە لەو پیاوەی ڕوانی کە نە سەری موویەکی پێوەیەو نە دەموچاوی ڕیشی هەیە، لەو ساتە

کەمەدا ناسیەوە.

ئـەو کاهینـە گـۆڤینـدا بـوو، گـۆڤینـداش پیرببـوو، بـەڵام هێـشتا ڕوخساری ئـەو تایبـەتـەندیـەی جارانی پاراسـتبوو، هێشتا نیشانەی ئیشتیاقو وەفاداریو وریاییو کەفو کوڵی تێدا دەبینرا، بەڵام کاتێک گۆڤیندا هەستی بە نیگاکانی ئەو کردو چاوی گێڕاو لە سیدهارتای ڕوانیو چاو تێبڕی، سیدهارتا لەوە تێگەیشت کە گۆڤیندا ئەو ناناسیێتەوە، گۆڤیندا خۆشحاڵ بوو بەوەی کە سیدهارتا خەبەری بووەوە، چونکە ماوەیەکی دورودرێژ بوو لەو شوێنەدا بەدیاریەوە دانیشتبوو تاوەکو لەخەو هەستێت، سەرباری ئەوەی کە هێشتا نەیدەناسیەوە.

سیدهارتا وتی: من خەوتبوم، تۆ چۆن هاتیت بۆ ئێرە؟ گۆڤیندا وەڵامی دایەوە: تۆ خەوتبویت، بەڵام دەبێ بزانی کە لەم جۆرە شوێنانەی دارستاندا خەوتن باش نیە، چونکە مارو ئاژەڵێکی بێ شومار دێنە ئەم شوێنانەوە لەدارستاندا، من یەکێکم لە شوێنکەوتوانی گۆتاما بودای "ساکیامونی"، لەگەڵ ژمارەیەک لە هاوئاینەکانم لە سەفەردام، لەڕێگە تۆم بینی خەوتبوویت، هاوڕێکانی خۆمم جێهێشتو لە تەنیشتەوە دانیشتم، ویستم خەبەرت کەمەوە، بەڵام لە خەوێکی قوڵدا بووی، بەڵام منیش کە دەمویست پاسەوانی تۆبکەم خۆشم خەوم لێکەوت، وەک ئەوەی ماندویەتی لە پێی خستبم، من پاسەوانێکی باش نەبووم، بەڵام بەهەر حاڵ ئەوەتا خەبەرت بووەتەوە منیش دەبێ بڕۆمو بگەم بە هاوڕێکانم

–ئەی سامانا.. زۆر سوپاسی تۆ دەکەم من خەوتوومو تۆ پاسەوانیت کردوم، شوێنکەوتوانی ئەو پیاوە حەکیمو تاقانەیە زۆر





میهرەبانن، ئەتوانی ئێستە بە ڕێگای خۆتدا بڕۆی.

–من دەبێت بڕۆم، ئومێدەوارم سەلامەت بیت،

–ئەی سامانا.. سوپاسی بێ پایانت دەکەم

گۆڤیندا سەری ڕێزی بۆ دانەواندو وتی: خوات لەگەڵ

سیدهارتا وتی: خوات لەگەڵ ئەی گۆڤیندا

کاهین بێ جوڵە وەستا،

–ببورە بەڕێز چۆن ناوی من دەزانی؟

لێرەدا سیدهارتا پێکەنی،

–ئەی گۆڤیندا، من لەو کاتەوە تۆ دەناسم کە لەماڵی باوکت بووی، ئەو ساتەی دەچوویتە قوتابخانەی براهماکانەوە، لەو کاتەوە دەتناسم کە قوربانیەکانت دەبەخشیو لەگەڵ ساماناکانداو لە دارستان پێکەوە دەژیاین، لەو کاتەوە دەتناسم کە چوینە باغی "جیتاوا"و تۆ سوێندو پەیمانی دۆستایەتیت بەست لەگەڵ بودای تاقانەدا.

گۆڤیندا بەدەنگی بەرز هاواری کرد: تۆ سیدهارتای، ئێستە دەتناسم، نازانم پێشتر بۆ نەمناسیتەوە، سڵاو بۆ تۆ ئەی سیدهارتا، دیداری تۆ خۆشبەختیەکی گەورەیە،

–منیش خۆشحاڵمو خۆشبەحتم بە دیداری تۆ، لەکاتی خەوتنندا تۆ پاسەوانیت کردم، جارێکی تر سوپاست دەکەم ، هەرچەندە من پێویستم بە پاسەوانی نەبوو، ئەی دۆستی من بۆ کوێ دەچی؟

بۆ شوێنێکی دیاری کراو ناڕۆم، ئێمەی کاهین جگە لە وەرزە باراناویەکان، هەمیشە لە سەفەرداین، جێ گۆڕکێ دەکەین، لەم شوێنەوە بۆ ئەو شوێن، بە پێی ڕێنماییە پیرۆزەکان ژیان بەسەردەبەین، پەندو ئامۆژگاریەکانی بوودا وەک وانە دەڵێینەوە،

خێروخێرات کۆدەکەینەوەو بەرێگای خۆماندا دەڕۆینو بەردەوام دەبین، ژیانی ئێمە بەم جۆرەیە، بەڵام سیدهارتا تۆ بۆ کوێ دەچی؟

سیدهارتا وتی: منیش وەکو تۆم، بۆ هیچ شوێنێک ناچم، بەڵکو تەنها بەرێوەم، منیش زیارەتێک دەکەم.

گۆڤیندا وتی: تۆ دەڵێیت لە سەفەرو لە رێگای زیارەتکردندام، باوەڕ بە قسەکانت دەکەم، بەڵام ئەی سیدهارتا بم بەخشە، چونکە تۆ وەک زیارەتکاران نایەیتە پێش چاو، تۆ جلو بەرگی دەوڵەمەندەکانت پۆشیوەو کەوشی ئەو پیاوانەت لەپێدایە کە خاوەنی جلو بەرگی گرانبەهان، مووەکانت بۆنی عەتریان لێدێ، وەک مووی زیاترکاران نین، تەنانەت لەموی سامانایەکیش ناچن.

ئەی دۆستی من، تۆ هەموو شتێکت بە باشی دیوەو ، بە وردبینیەوە تەماشات کردووە، بەڵام من نەمووت دەبمە یەک سامانا، بەتۆم وت کەمنیش دەچم بۆ زیارەتو ئەم قسەیەش دروستە.

گۆڤیندا وتی: تۆ بۆ زیارەت دەچی، بەڵام دەزانی کۆمەڵە کەسانێکی زۆر بەو جۆرە کەوشو جلو بەرگەوەو بە قژی عەتراویەوە دەچن بۆ زیارەت، من کە ئەوەندە لە گەشتو زیارەتکردندام تا ئێستە هیچ گەشتکەرو زیارەتکارێکم بەمجۆرە نەبینیوە.

-ئەی گۆڤیندا، دەزانم ڕاستدەکەی، بەڵام تۆ ئەمڕۆ موسافیرێک بەو جۆرە جلو بەرگو حاڵەتەوە دەبینی، گۆڤیندای خۆشەویست.. لە بیرت نەچێ کە دنیای ڕواڵەت دنیایەکی تێپەڕە، شێوەی جلو بەرگو ئارایشکردنی قژو ریش زۆر تێپەڕەو زووبەسەر دەچێت، سەروریشی ئێمەو جەستەی ئێمەش لەناودەچێت، تۆ بەوردیو بەدروستی لەهەموو شتێکت ڕوانی، من جلی خەڵکانی دەوڵەمەندم لەبەردایە،





چونکە پیاوێکی دەوڵەمەندبوومو منیش ئارایشی قژوو ڕیشم وەک خەڵکانی دونیا ڕێکخستوە، چونکە خۆشم یەکێک بووم لەوانە.

-سیدهارتا ئەی ئێستە چیت؟

-نازانم... منیش وەک تۆ هیچ نازانم، بەرێگەی خۆمدا دەڕۆم، پیاوێکی دەوڵەمەندبوم، بەڵام ئێستە دەوڵەمەندنیم، ئەوەتا نازانم سبەینێ چیم بەسەر دێت.

-ئایا سەروەتەکەی خۆتت لەدەست داوە؟

-من سەروەتم لەدەستداوە، سەروەتیش منی لەدەستداوە، گۆڤیندا بەڕاستی نازانم.. شێوەو ڕوخساری گەردوون زۆر بەخێرایی دەسووڕێت، ئەو سیدهارتا براهمایە لە کوێیە؟ ئەو سیدهارتا دەوڵەمەندە لە کوێیە؟ ئەو سیدهارتا سامانایە کوا؟ شتە فانیەکان زوو دەگۆڕێن، ئەی گۆڤیندا تۆ ئەمانە ئەزانی؟

ماوەیەکی دوورو درێژ گۆڤیندا بەگومانو نائارامیەوە لە دۆستەکەی سەردەمی لاویەتی ڕوانیو پاشان سەری ڕێزی بۆ دانەواند، کە نەریتێکی پیاوە مەزنەکان بوو، دواتر بە ڕێگای خۆیدا ڕۆیشت.

سیدهارتا بەزەردەخەنەوە چاوی لەسەر ڕۆیشتنەکەی بوو، هێشتا ئەو دۆستە شەیداو بەوەفایەی خۆشدەویست، چۆن دەیتوانی لەو کاتژمێرەداو لەو ساتە گرانبەهاو دەگمەنەدا کە خەوی لێکەوتبوو وشەی ئوم ی لەسەر زمان بوو، کەسێک یان شتێکی خۆش نەوێت، ئەوە جادویەک بوو لە خەوا لێیکرابوو کە ئوم ی لەخۆیدا دەبینیەوە، ئەو هەموو شتێکی خۆشدەویست، هەر شتێکی دەبینی پڕبوو لە عەشقو خۆشەویستیو دۆستایەتی، بۆیە لەوە تێگەیشت کەبۆچی لە ڕابردوودا ئەوەندە نەخۆشو زەلیلو داماوبوو، لەوەش تێگەیشت کە

ئەو کاتە چۆن نەیتوانیوە کەسێک یان شتێکی خۆشبوێت.

سیدهارتا بە زەردخەنەوە سەیری ئەو کاهینەی دەکرد کە وردە وردە دووردەکەوتەوە، خەوەکەی بەهێزتری کردبوو، بەڵام لە برسیەتیەکی قورسو سەختدا گیری خواردبوو، چونکە دوو ڕۆژ بوو هیچی نەخواردبوو، لەو حاڵەتی پێکەنینو مەینەتی برسیەتیەدا بوو ئەوەی بیرکەوتەوە کە لە سێ شتی مەزنو پایەداری خۆی، سێ شتی فرۆشتوە بەکەماڵە،لە ڕۆژوگرتنو سەبرکردنو بیرکردنەوە، کە شانازی پێوە دەکردن، ئەو سێ شتە کە سەروەتو هێزو دەسەڵاتو پەناگای ئەو بوون، تەنها ئەو سێ شتە بوون کە لە ساڵانێکی سەختو پڕ دەردی سەری سەردەمی لاوییدا فێریان ببوو، لەوانە شتێکی لەبەردەستدانەبوو، بۆیە نەیدەتوانی ڕۆژو بگرێت، بیربکاتەوەو سەبری هەبێت، ئەوانەی گۆڕیبووە بە خراپترین شتی پوچو بێ مانا، ئەوانەی گۆڕیبویەوە بە چێژوو ئارەزوو ژیانی شاهانەو سەروەتمەندانە، ماوەیەکی زۆربوو کە ڕێگەیەکی تری دەبڕی کە پێدەچوو بووبێتە پیاوێکی سادەو بازاڕی.

سیدهارتا بیری لەو حاڵەتە کردەوە تێیکەوتبوو، بەڵام بیرکردنەوە گرفتئامێزبوو بۆ ئەو، تەواو ئارەزووی بیرکردنەوەی نەمابوو، دەشیزانی کە دەبێت خۆی ناچاربکات بە بیرکردنەوە.

بەوشێوە سیدهارتا لە بیرکردنەوەدا بوو، دەیبینی کە تەواوی شتە فانیەکان کەنەفتو زەلیلن، خەریکە وەک سەردەمی مناڵی جارێکیتر لەژێر خۆرەتاوا ئۆقرەدەگرێت.

دەیوت هیچ شتێک پەیوەندی بە منەوەنیە، هیچ شتێکیش نازانم، نابمە خاوەنی هیچ شتێکو فێری هیچ شتێکیش نەبووم، چەند سەیرو سەمەرەیە دوای سپی بوونی قژوو موەکان، دوای لاوازبوونو





لەدەستدانی هێزی لاویەتی، دەبێت سەرلەنوێ وەک سەردەمی مناڵی فێری هەموو شتەکان ببینەوە، جارێکی تر زەخەنەی کرد، بەڵێ چارەنوسێکی سەیربوو، پەشیمان بوو، لەو دونیایەدا خۆی بە دەستبەتاڵو خاڵیو ڕووتو نەزان بینیەوە، بەڵام بەوانە غەمبار نەبوو، نەخێر... بەڵکو لەخۆیدا هەستی بە ئارەزویەکی قوڵ کرد کە پێبکەنێت، دەیویست لەناخەوە بەو جیهانە سەیرو شێتانەیە پێبکەنێت، پێکەنیو بە خۆی وت: هەموو شتێک لەگەڵتا دەگەڕێتەوە.

لەگەڵ خۆیدا لەبیرکردنەوەیەکی قوڵدابوو، سەیرێکی ڕووباری کرد، بینی  کە چۆن شەپۆلو ڕەوتی ئاویش بۆ دواوە دەگەڕێتەوەو لەکەماڵی شادیەوە گۆرانی دەڵێت، بە بیستنی دەنگی ئاوەکە ئێجگار خۆشحاڵ بوو،  پێکەنی بۆ ڕووبارەکە، مەگەر ئەوە ئەو ڕووبارە نەبوو کە ڕۆژانێک دەیویست خۆی تێدا نوقم بکات، ئەوە چ سەردەمێک بوو؟ سەدەها ساڵ پێشتر؟ ئەوەش جگە لە خەونێک هیچی تر نەبوو؟.

بیری لەوە دەکردەوە ژیانی چەند سەیرو سەمەرەیە، لە ڕێگایەکی سەیردا سەرگەردان بوو، لە سەردەمی منداڵیدا سەرقاڵی قوربانیەکانو خوداکان، لە سەردەمی لاویدا پابەندی خەڵوەتکێشانو بیرکردنەوەو تێڕامان، بەخۆی وت: من عەودالی براهما بووم، ئەبەدیەتم لە ئاتمانا دەبینیو ڕێزم لێ دەگرت، لەلاویدا سەرنجم لەسەر ڕەدکردنەوەی نەفس بوو، لە دارستاندا ژیامو لەسەرماو گەرمادا مەینتم کێشا، فێربووم چۆن ڕۆژو بگرمو چۆن جەستەی خۆم ڕام بکەم، ئەوسا  سەرسامی ڕێنماییەکانی بودای پیرۆزم لا ئاشکرابوو، ئەوکاتە هەستم کرد کە مەعریفەو یەکیەتی جیهان هەمووی لە دەمارەکانی مندا دێتو دەچێت، بەڵام ئەو کاتەش هەستم

کرد دبێت واز لە بوداو ئەو حیکمەتە گەورەیەش بهێنم، ڕۆشتمو چێژەکانی عەشقم لە کەمالەو بازرگانیش لەکاماسڤاتیەوە فێربووم، سەروەتو سامانم کۆکردەوەو پەرتوبڵاویشمکرد، مەیلو ئارەزووم پەیدا کرد بۆ خواردنی نایاب، هەروەها فێری ئەوەش بووم کە چۆن هەستکانم ببزوێنم، بێگومان ساڵانێکی دووردودرێژم بەو شێوەیە گوزەراند، تێگەیشتنو هێزی بیرکردنەوەم لەدەستدا، یەکیەتی ئەو شتانەم فەرامۆش کرد کە بە دویاندا گەڕابووم، پێدەچێت بە هێمنیو بەدرێژایی دابەشکردنەکان، لە گەورەیی تێپەڕییم بەرەو منالّی؟ مەگەر من لە پیاوێکی بیرکەرەوەوە نەبووم بە پیاوێکی سادە؟ لە هەمان کاتدا ئەم ڕێگەیە زۆر دروست بوو، ئەو باڵندەیە کە لە دڵمدا نیشتەجێ بوو نەمردووە بۆ ئەوەی دووبارە منالّ ببمەوە، سەر لە نوێ ژیان دەسپێ بکەمەوە، دەبوو ئەو هەموو نەزانینە ئەزمون بکەمو ئەو هەموو گوهانە بکەم، ئەوەندە بە هەڵەدا بچم، گرفتاری ئەو هەموو نەفرەتەبم، بەو ئەندازەیە نائومێدی ببینمو زەحمەت بکێشم، بەڵام ڕێگای گەیشتن بە ئامانج لەهەموو حاڵەتێکدا هەر بەو جۆرەیە، دڵی منو چاوەکانم گەواهی ئەو ڕاستیەن، بۆ ئەوەی بتوانم جارێکی تر وشەی پیرۆزی ئوم ببیستم، بۆ ئەوەی جارێکی تر خەوم لێبکەوێتو دووبارە بێداربیمەوە، هەست بە تازەبونەوە بکەمو ئەو هەموو جوانیە ئەزمون بکەم، دەبوو مەزەی نائومێدیم بچێژم، دەبوو تا نزمترین پلەی بێ هۆشی هەرەس بێنمو بیر لە خۆکوشتن بکەمەوە.

بۆ ئەوەی ئاتمان لە خۆمدا بدۆزمەوە دەبوو دووبارە نەزان ببمەوە، لەپێناوی ژیاندا جارێکی تر گوناە بکەم، ئەم ڕێگەیە بۆ کوێم پەلکێش دەکات؟ ئەم ڕێگەیە زۆر گەمژانەیە، ناکرێت ئەو ڕێگا ئاڵۆزە لەشێوەی بازنەیەکی داخراودا بێت، بەڵام هەر جۆرێک بێت





تاقیدەکەینەوە.

سیدهارتا لەو شادیە بەئاگا بوو کە بەسەریا زاڵببوو، لەخۆی پرسی: سەرچاوەی ئەم شادیە لە کوێیە؟ هۆکاری ئەو هەستکردنە چیە بە دڵخۆشی؟

ئایا ئەو خەوە دوورو درێژو قوڵە ئەوەندە سودمەندو ڕاست بووە بۆمن؟ ئایا ئەوەش سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ وشەی ئوم، یان هۆکاری ئەوەیە کە من هەڵهاتبوم، ئێستە هەڵهاتنی من کۆتایی هاتووەو جارێکی تر ئازادیم بەدەستهێناوەو وەک منداڵێک لەژێر ئاسماندا وەستاوم، ئای... ئەو یاخی بوونو هەڵهاتنە چەند باشو مەزنە، ئەو شوێنەی کە من لە ئاسمان هەڵهاتم، شوێنی عەترو دوکان، شوێنی زیادەڕۆییو بێدەنگیو بیکردنەوەو ڕۆح بوو؟ جیهانی دەوڵەمەندان لە پێش چاوم چەند نەفرەتی بوو، لەناو ئەو یارییو عەشقبازیەدا چەند ماندو مەینەتی بووم، لەپێناو ئەو ماوە دوورو درێژەدا کەلەو جیهانەدا بووم چەند نەفرەتم لە خۆم کردووە، چەند ئەشکەنجەی خۆمم داوە، ژەهرخواردوو، پیرو ناشرین بوومو لەخۆم بێزار بووم، چیتر وەک ڕابردوو شانازیم بەزیرەکی خۆمەوە نەدەکرد، بەڵام کارێکم کردووە کە بەباشی دەزانمو لەو بارەیەشەوە دڵ خۆشی خۆم دەدەمەوە من چیتر کۆتایم بەو بێزاریە ڕۆحیو ژیانە پوچو بێ مانایە هێناوە.

ئەی سیدهارتا.. ئێستە دوای ئەوەی کە ئەو هەموو نیگەرانیە دووردرێژە هاواری باڵندەکەت لەناو دڵی خۆتدا بیستوەو شتێکت دەستگیربوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە مەبەستێکی گەورەت هەبوە، من لەم بارەیەوە دەستخۆشیو پیرۆزبایت لێ دەکەم،

سیدهارتا بەو شێوەیە دڵخۆشی خۆی دەکرد، بە سەرنجەوە گوێی

دەگرت لە دەنگی گەدەی چونکە لەبرسیەتیەکی نالەباردا بوو، هەستی دەکرد لە ڕابردوودا مەینەتو بەدبەختی چەشتوەو هەنوکە وەلای خستوە، هەروەها بڕێکی زۆر لەو دەردو مەینەتیانەی تا ئەو شوێنە ئەزمونکردوە کە بەرەو مەرگو نائومێدی پەلکێشی بکات، ئەو دەیتوانی ماوەیەکی دووردرێژ لای کاماسڤاتی بمێنێتەوە، پارەوپول بەدەست بهێنێتو فڕێشی بدات، جەستەی تێر خواردن بکاتو ڕۆحی بە برسیەتی بهێڵێتەو، ئەگەر ئەو چرکە ساتە نائومێدو قوڵە نەبوایە کە لەسەر درەختەکەوە خۆی شۆڕکردبوەوە بەرەو ڕوبارەکە، هێشتا دەیتوانی لە دۆزەخی ژیانی شاردا بمێنێتەوە، ئەگەر نائومێدی ئەو نەفرەتە قوڵە شکستخواردووی نەکردایە، ئەو باڵندە زیندوو نەدەبوەوە، ئەو کانیە سازگارەش نەدەکەوتەوە جمانو هەڵقوڵین، ئەو ئاوازە بێگەردەی کە هێشتا لە دەرونیدا زیندوبوو جارێکی تر نەدەبیسترا، بەو بۆنەیەوە دڵی شادبوو پێدەکەنی، ڕووخساری لەژێر مووە خۆڵەمیشیەکانیدا بەنوری دەرونی دەدرەوشایەوەو بەخۆیی دەوت: مرۆڤ بتوانێ خۆی تاقی بکاتەوە کارێکی باشە، لەسەردەمی منداڵیدا جەختم لەو خاڵە دەکردەوە کە ماڵو چێژەکانی دونیا باش نین، زەمانێکی دوورو درێژبوو ئەم نهێنیەم دەزانی، بەڵام دواجار ئەوەشم دەسکەوتو  تاقیمکردەوە، ئەمە نەک تەنها بە بیرکردنەوەو عەقڵ لەوە تێدەگەم، بەڵکو دەتوانم بە دڵو گەدەو چاویش هەست بەوە بکەم، ماوەیەکی زۆر بیری لەو گۆڕانکاریە کردەوە کەتێیدا ڕوویدا، بینی جارێکیتر ئەو باڵندە لەناو دڵو سینەیدا دەستیکردوەتەوە بە خوێندن، بیری لەوە دەکردەوە ئەگەر ئەو باڵندەی دڵی بمردایە ئیتر چۆن دەیتوانی بمێنێتەوە؟ نەخێر.. شتێکیتر لەوا مردووە، شتێک کە ماوەیەکی زۆر خوازیاری مردنی بوو، مەگەر ئەو شتە نەبوو کە بە





درێژایی سالآنی خەڵوەتکێشانی ئاواتەخواز بوو بمرێت؟ مەگەر ئەوە نەفسی ئەو نەبوو، مەگەر ئەوە نەفسی بچوکو لەخۆباییو ترساوی ئەو نەبوو کە سالآنێکی دوورودرێژ دەستو پەنجەی لەگەڵ نەرم کردوو بوو شکستیخوارد بوو بەدەستیەوە، سات لەدوای سات خۆی ئاشکرا دەکرد؟ مەگەر ئەوە ئەو نەفسە نەبوو کە ئەمڕۆ لەقەراغی ئەو دارستانو ڕووبارە جوانەدا مردو لەناوچوو؟

مەگەر بەهۆی ئەو مردنەوە نەبوو کە وەک منالێک پڕ ببوو لە وزەو نەترسانو متمانەکردن؟

سیدهارتا لەوە تێگەیشت کە بۆچی ئەو لە سەردەمی براهماییو یان لە سەردەمی خەڵوەتکێشاندا لەگەڵ ئەو نەفسەدا بێ هودە لە جەنگدا بوو، ئەو هەموو سرودە پیرۆزانە ئەو هەموو قوربانیانە، ئەو هەموو لەناو بردنەی جەستە، ئەو هەموو هەوڵو کۆششو ڕەفتارانە، هەموویان لە پێناو ئەوەدا بوو کە کەمێک نەفسی لاواز بکات، سیدهارتا خۆویستو مەزن بوو، خۆی لە هەمووان هۆشمەندترو تامەزرۆتر دەزانی، نەفسی ئەو بەشێوەی زاهیدو مەزنکارو تێگەیشتوو حەکیم خۆی دەرخستبوو، ئەو نەفسە لە ڕۆحیدا نیشتەجێ بوو گەشەی دەکرد، لە خەیاڵی ئەوەدا بوو کە دەکرێت بە ڕۆژوگرتنو خەڵوەتکێشان لەناو ببرێت، دەیزانی کە ئەو نەفسەبوو، بوو بە هۆکاری تێکەڵ بونی بە کاروانەکانی دونیاو خۆی لە ناو هێزی ژنو پارەدا ونبکات، وەک بازرگانو قومابازو شەرابخۆرو خاوەندار دەرکەوێت، تاوەکو ئەو ساماناو کاهینانەی کە لە ناخیدا هەن لەناوبچن، لە پێناوی ئەوەدا بوو کە بەدرێژایی سالآنێکی ترسناکو نەفرەتئامێز  مەینەت بکێشێو وانەی ژیانێکی  بێهودەو سەراپا پوچ فێرببێتو دواجار بە پوچیو نائومێدی کۆتایی بێت،

تاوەکو سیدهارتای نەفرەت پەرستو سیدهارتای بازرگانو خاوەنداری تێدا بمرێت، ئەو مردبوو، سیدهارتایەکی تازەش لەو خەونەی مەرگ بەخەبەر هاتبو، ئەویش ڕۆژێک پیر دەبێتو دەمرێت، سیدهارتا شتێکی فانی بوو، هەموو شێوەو ڕوخسارەکانی فانین، بەڵام ئەمڕۆ ئەو لاو بوو، ئەمڕۆ ئەو سیدهارتا لاوە وەک منداڵێک زۆر خۆشحاڵ بوو.

ئەو جۆرە خەیاڵانە بەمێشکیدا دەهاتن، بە پێکەنینو زەردەخەنەوە گوێی لە دەنگی سکی دەگرت، گوێی لە ویزەی هەنگێک بوو بەسەر گوڵەکاندا دەفڕی، لە کەماڵی خۆشحاڵیدا گوێی بۆ ئەو ڕووبارە هەڵخست کە لە ڕۆشتنێکی بەردەوامدابوو، هیچ ڕوبارێک هێندەی ئەو ڕووبارە سەرنجی ڕانەکێشابوو، ئاوازو دیمەنی هیچ ئاوێک بەو شێوە جوانو سەرسوڕهێنەر نەبوو، پێیوابوو کە ڕووبار نهێنیەکی تایبەتی پێیەو بە گۆرانیەوە دەیڵێتو دەیخاتە سەر زمان، ئەو نهێنیە شتێک بوو کە ئەو لێی بێئاگابوو، شتێک کە لە چاوەڕوانی ئەودا بوو.

سیدهارتا دەیویست خۆی لەو ڕوبارەدا نوقم بکات، سیدهارتای پیرۆزو بێزارو غەمگین ئەمڕۆ لەوێدا نوقم ببوو، ئەو سیدهارتا تازەیە هەستی بەعەشقو تاسەو ئارەزویەکی زۆردەکرد بەرامبەر ئەو ئاوە سازگارە.

بڕیاری دا چیتر بەو زوویە ئەو شوێنە جێنەهێڵێت.

***





# بەلەمەوان

سیدهارتا بەخۆی وت: لەکەناری ئەم ڕووبارەدا دەمێنمەوە، ئەمە ئەو ڕووبارەیە کە ڕۆژێک تێیدا پەڕیمەوە بەو مەبەستەی بگەمە شار، بەلەمەوانێکی بەخشندە پەڕاندمیەوە بۆ ئەمبەرو چوومە لای ئەو، ڕۆژگارێک کوخەکەی ئەو چارەنوسی منی گەیاندە ئەو ژیانە نوێیەی کە ئیستە لەناوچووە، چیتر ئێستا دەبێت ژیانی تازەو ڕێگای تازەی منیش لێرەدا دەست پێبکات.

بە چاوێکی پڕ لە ئەویندارییەوە لەو ئاوە سازگارو سەوزباوەی ڕوانیو سەیری هێڵە کریستاڵیەکانی سەر ئاوەکەی کردو ئەو بڵقە سەرئاوکەوتوانەی بینی کە وەک مرواری لە ناو ڕوبارەوە سەرئاو دەکەونو شینایی ئاسمانیان تیا دەبینرێتەوە، سیدهارتا ئەو ڕووبارەی چەند خۆشدەویستو چەند سەرنجی ڕاکێشابوو، چەند خۆی بە قەرزاری کاریگەریەکانی ئەو روبارە دەزانی!! لە ناخی دڵیەوە گوێی لە ئاوازێک بوو کە دەیوت" ئەو ڕووبارەت خۆشبوێتو لە کەنارەکانیدا بمێنەرەوە، ئارام بگرەو شتی لێوە فێربە".

بەڵێ دەیویست لەو ڕووبارەوە فێری شتەکان بێت، دەیویست گوێی لێبگرێت، لەو باوەڕەدابوو کە هەر کەسێک لەو ڕووبارە تێبگاتو نهێنیەکانی بزانێت، لە هەموو نهێنیەکان تێدەگات.

بەڵام ئەمڕۆ تەنها یەکێک لە نهێنیەکان فێربووە، ئەو نهێنیەش ڕۆحی ئەوی داگیرکردبوو، دەیبینی کە ئاو هەمیشە لە گوزەردایەو

تێدەپەڕێت، بەڵام لە هەمان کاتداو هەمیشە لە جێگەی خۆیدایەو هەمیشەش هەروا بووەو هەموو ساتەوەختێکیش تازە دەبێتەوە.

ئایا دەیتوانی لەوە تێبگاتو ببیبنێت؟

سـیدهارتا توانـای تێگـەیـشتنی ئـەوەی نـەبـوو، ئـەوەشـی کـە تێدەگەشت، پڕبوو لە دڵەڕاوکێو لە بیرەوەریەکی بێهێزو ئاوازێکی ئاسمانی دەچوو.

سیدهارتا ڕاچەنی، چیتر ئازارو ئەشکەنجەی برسیەتی لەوە تێپەڕی بوو بەرگەی بگرێت، بە کەناری ڕووبارەکەدا کەوتەڕێو گوێی هەڵخست بۆ ئەو برسیەتیە سەختەی کە هەستی پێدەکردو بۆ نەغمەو ئاوازی شەپۆلەکان.

گـەشـتە ئـەو شـوێنەی کـە بـەلـەمـەکـەی تێدابـەسـترابوو، ئـەو بەلەمەوانەی بینیەوە کە زەمانێک وەک ساماناییەکی لاو سیدهارتای لەوێوە پەڕاندبووەوە، سیدهارتا بەلەمەوانەکەی ناسیەوە، ئەویش ئێجگار پیربووو.

سیدهارتا لێی پرسی: ئایا دەتوانی بمپەڕێنیتەوە بۆ ئەو بەری ڕووبار؟

بەلەمەوانەکە بە بینینی پیاوێکی وا نورانیو بەویقار کە بە تەنهاو بەپێ لە دارستانەوە بەپێ کەوتوەتە ڕێ، زۆر بە قوڵی سەری سوڕماو بردیە ناو بەلەمەکەوەو دەستیکرد بە سەوڵ لێدان.

سیدهارتا وتی: تۆ ژیانێکی زۆر خۆشت هەڵبژاردووە، ژیان لە کەناری ئەم ڕووبارەدا زۆر خۆشو مەزنەو ئاوا هەموو ڕۆژێکیش بەناویا بگەڕێی.

بەلەمەوان زەردەخەنەیەکی کردوو بە هێمنی سەوڵی لێدەداو وتی:





بەڵێ... بەڕێز زۆر خۆشە، بەڵام مەگەر ژیانو کارکردن بەهەر جۆرێک بێت خۆش نیە؟

-لەوانەیە، بەڵام من ئیرەیی بەو ژیانەی تۆ دەبەم کە هەڵت بژاردووە؟

-ئاه.. ئێوە ناتوانن حەوسەڵەی ئەم کارەتان هەبێت، ئەم کارە بۆ ئەو خەڵکانەنیە کە جلو بەرگە گران بەهاکان دەپۆشن، سیدهارتا پێکەنی ووتی: ئەمڕۆ ئەمە جاری دووهەمە کە دەربارەی جلەکانم قسە دەکەنو بە گومانەوە تەماشام دەکەن، ئایا ئەم جلو بەرگەی من قەبوڵ دەکەی کە بە برِوای من هۆکاری مەینەتو زەحمەتە، چوونکە من بۆ ئەوەی حەقی تۆ بدەم لەمەزیاتر هیچ پارەو سامانێکی ترم پێنیە.

بەلەمەوان پێکەنیو وتی: بەڕیز، گاڵتەدەکەیت.

-نەخێر.. دۆستی من گاڵتە ناکەم، تۆ جارێکی تر لێرەوە منت پەڕاندەوەو کرێت لێوەرنەگرتم، دەخوازم ئەمڕۆ ئەم جلانەم لێوەرگریت لە بری کرێی هەردوو جارەکە

-بەڕێزم.. کەواتە تۆ بێ پۆشاک دەمێنیتەوە

-دەمەوێ چیتر لەمەزیاتر نەڕۆم، ئەگەر جلکەیەکی کۆنەت هەیە بیدەی بە منو وەک قوتابیەک یان بەردەستێکی خۆت وەرمگرە، چونکە دەبێت یەکەمین سەوڵ لێدانو بەلەمەوانی لە تۆوە فێربم.

بەلەمەوان، ماوەیەک بەوپەڕی سەرسامیەوە لەو پیاوە سەیرو سەمەرەی ڕوانیو دواجار پێی وت: من دەتناسمەوە، بیرم کەوتەوە.. شەوێک لە کوخەکەی مندا خەوتی، ماوەیەکی زۆر لەمەوبەربوو، لەوانەیە زیاد لە بیست ساڵی بەسەرا تێپەڕیبێت، من تۆم لە

ڕووبارەکە پەڕاندەوەو وەک دوو دۆست لێکدی جیابووینەوە، باشە تۆ ئەو کاتە سامان نەبووی؟ ناوتم نایەتەوە یاد.

-ناوم سیدهارتایە، ئەو کاتەی منت لە ڕووبارەکە پەراندەوە سامانا بووم

-سیدهارتا بەخێربێیت، من ناوم "ڤاسیوڤیدا"یە، ئومێدەوارم ئەمڕۆ میوانی من بیتو لە کوخەکەمدا بخەویو پێم بڵێی لە کوێوە هاتویتو بۆچی ئەوەندە ماندوو بێزاری لەو جلوبەرگە نایابەت؟

لە ناوەڕاستی ڕووبارەکەدا بوون، ڤاسیوڤیدا بەهۆی شەپۆلو جوانی ئاوەکەوە سەیری دواوەی بەلەمەکەی دەکرد، بەوپەڕی ئارامیەوە بە بازوە بەهێزەکانیو بە توانایەکی زیاترەوە سەوڵی لێدەدا.

سیدهارتا دانیشتبوو سەیری ئەوی دەکردو بیری کەوتەوە چۆن لە سەردەمی خەڵوەتکێشاندا لەناخیدا هەستی بە خۆشەویستی ئەو بەلەمەوانە دەکرد. میوانداریەکەی ڤاسیوڤیدای قەبوڵ کردوو گەشتنە ئەوبەری ڕووبارەکەو لەبەستنەوەی بەلەمەکەدا هاوکاری ڤاسیوڤیدای کرد، پاشان ڤاسیوڤیدا بردیە کوخەکەی خۆیەوەو نانو ئاوو میوەی" ئانبە" ی بۆ دانا، سیدهارتاش بەوپەڕی تامەزرۆییەوە خواردی.

کەمێک درەنگتر، ئەو کاتەی کە خۆر ئاوا دەبوو، هەدوکیان لە قەراغی ڕووبارەکەداو لەژێر درەختێکدا دانشتن، سیدهارتا بنو بنەچەو ژیانی خۆی بۆ باس کرد، کە چۆن ساتەکانی نائومێدی بەسەر بردووە، گێڕانەوەی ئەو حیکایەتە تا شەو درێژەی کێشا، ڤاسیوڤیدا بە وردیو بەسەرنجێکی زۆرەوە گوێی لەو حیکایەتە دەگرت، حیکایەتی نەژادو بنەچەی، سەردەمی منالّی، چۆنیەتی





خوێندنی، چیرۆکی گەڕانو تێرامانی، چێژو ئارەزوەکانی، گوێی لە هەمووی گرت، یەکێک لە خەسڵەتەکانی ئەو پیاوە بەلەمەوانە ئەوەبوو، کە بە پێچەوانەی هەموو کەسێکەوە دەیزانی چۆن گوێ بگرێت، بەبێ ئەوەی وشەیەک بدرکێنێ، قسەکەر هەستی دەکرد ڤاسیوڤیدا لە حاڵەتی بێدەنگیو چاوەڕوانیدایەو بەوردی گوێی لە قسەکانی گرتووەو وشەیەکی بەسەرا تێنەپەڕیوە، ئەویش بە نائارامیەوە گوێی نەدەگرت، چاوەڕوانی نەدەکرد، هیچ کاتێک سەرزەنشتو دڵخۆشی نەدەکرد، بەڵکو تەناه گوێی دەگرت، سیدهارتا هەستی کرد بوونی گوێگرێکی وا کەبتوانێت ژیانو دەردی سەریو مەینەتیەکانی ئەو ئاوا وەرگرێتو تێبگات، چەند باشو مایەی دڵخۆشیە، بەهەر حاڵ، لەکۆتای بەسەرهاتەکەیدا چیرۆکی درەختو روبارو نائومێدی، کاریگەری وشەی پیرۆز ی ئوم، چۆنیەتی خەولێکەوتنو بەئاگاهاتنەوەی، هەستی ئەو عەوشقە قوڵەی هەیەتی بۆ ڕووبار، هەمووی گێڕایەوە، بەلەمەوانەکە بەچاوداخستنەوە تەواو بە سەرنجەوە گوێی لێگرتبوو.

کاتێک سیدهارتا بەسەرهاتەکەی تەواوکرد، ڤاسیوڤیدا وتی: هەربەوشێوەی کەمن بیرم لێکردۆتەوە، روبار قسەی لەگەڵ تۆدا کردووەو خۆشەویستی بۆ تۆ هەیەو قسەی لەگەڵدا کردووی، ئەمە زۆر باشە، زۆر زۆر باشە سیدهارتا، لێرە بمێنەرەوە ئەی دۆستی من، ڕۆژگارێک هاوسەرێکم هەبوو، چرپاکەی بە تەنیشت چرپاکەی منەوە بوو، بەڵام عەیامێکە ئەو مردووە، دێرزەمانێکە من لە تەنیایدا دەژیم، وەرە لێرە لەگەڵمدا بژی، لێرە چا و خواردنی پێویست بۆ هەردووکمان دەستدەکەوێت.

سیدھارتا وتی: زۆر سوپاسی تۆ دەکەم، میوانداریەکت بە دڵو بەگیان وەردەگرم، جارێکی تر سوپاست دەکەم لەوەی زۆر باش گوێت لە قسەکانم گرت، زۆر دەگمەنن ئەو پیاوانەی کە دەتوانن ئاوا بەجوانی گوێ بگرن، من تاوەکو ئێستە کەسێکم نەبینیوە وەک تۆ، من ئەم نهێنیەش لە تووە فێردەبم.

ڤاسیوڤیدا وتی: ڕاستە تۆ ئەو نهێنیە فێردەبی بەڵام نەک لەمنەوە، منیش ئەمە لە ڕووبارەوە فێربووم، ڕووبار فێری ئەم نهێنی گوێگرتنەی کردووم، تۆش لێیەوە فێردەبی، ڕووبار ئاگاداری هەموو شتێکە، ئەتوانیت هەموو شتەکان لەوەوە فێربین، ئەمەیە کەلە ڕووبارەوە فێربووی چونەوە ناوخۆتو نوقم بون لە خۆتداو گەڕان بۆ قوڵایی شتەکان لە خودی خۆتا باشە، تۆ ئەوەش لە ڕووبارەوە فێربوی کە سیدھارتای دەوڵەمەندو خانەدان بکەیتە بەلەمەوانو سەوڵ لێدەر، بەڵێ .. سیدھارتا ئەو براھما حەکیمە بۆ دۆزینەوەی نهێنیەکانی ڕووبار، بەلەمەوان دەپشکنێ، بەدڵنیاییەوە شت گەلێکی تریش فێر دەبی.

دوای بێدەنگیەکی دورودرێژ سیدھارتا وتی: ڤاسیوڤیدا، چ شتێکی تر؟

ڤاسیوڤیدا هەستایەوەو وتی: وا درەنگی کردووەو وازبێنە بابچینە سەر جێگاکانمان، ئەی دۆستی ئازیز، من ناتوانم پێت بڵێم کە ئەو شتانەی تر چین، ئەوانە خۆت بەدەستیان دەهێنیتو تێیاندەگەی، لەوانەیە ئەوەت زانیبێت کە من پیاوێکی دانانیم، من نازانم چۆن قسەبکەمو بیربکەمەوە، بەڵام دەزانم چۆن گوێ بگرمو پاک بم، جگە لەمە من شتێکی تر فێرنەبوم، ئەگەر بمتوانیبا قسەبکەمو وانەبڵێمەوە





پێدەچوو مامۆستایەک بوومایە، بەڵام بەم جۆرە کە دەمبینی بەلەمەوانێک زیاتر شتێکی ترنیم، کاری من ئەوەیە خەڵکی لە ڕووبار بپەڕێنمەوە، من هەزاران کەسم بەناو ئەو ڕووبارەدا پەڕاندوەتەوە، لای هەموویان ئەم ڕووبارە بەربەست بوو لە بەردەم سەفەرەکەیاندا، ئەوانە بەدوای پارەو بازرگانیدا سەفەریان دەکرد، یان دەچوون بۆ ژن هێنان، یان بەشداری زیارەتکردنیان دەکرد، بەڵام ڕووبار هەمان ڕووبارو بەلەمەوان هەمان بەلەمەوان بوو کە ڕزگار یدەکردن لەو بەربەستە، بەڵام لەناو ئەو هەزاران کەسانەدا ژمارەیەکی دیاریکراو، نزیکەی چوار تا پێنج کەس بوون ڕووباریان وەک بەربەستێک نەبینی لە بەردەم خۆیاندا، ئەوانەش ئاوازی ڕووباریان بیستبوو، گوێیان بۆ ڕادێرابوو، ڕوبار لەلایان پیرۆز بوو بەو شێوەیەی کە من دەیزانم، ئەی سیدھارتا.. وازبێنە بچمەوە سەر چرپاکەم.

سیدھارتا لای بەلەمەوانەکە مایەوەو، لای ئەو فێری بەلەمەوانی بوو، هەر کاتێک ئیشی نەبوایە لە کێڵگە برنجەکەی ڤاسیوڤیدادا کاریدەکرد، یان وشکەداری کۆدەکردەوەو لە درەختی مۆزەکان مۆزی دەچنیەوە، فێری سەوڵ دروستکردن ببوو، فێری ئەوەش ببوو کە چۆن ئاگاداری بەلەمەکە بێتو چاکیبکاتەوە، چۆن زەنبیلە بچنێت، لەهەر کارێک کە دەیکردو لەهەر شتێک کە فێری دەبوو دڵخۆشو کامەران بوو.

ڕۆژەکانو مانگەکان بەپەلە تێپەڕین، زۆر لەوەزیاتر لەڕوبارەوە فێربوو کە ڤاسیوڤیدا دەیتوانی قسەی لەسەر بکات، نهێنی وابەستەگی بە ڕووبارەوە فێربوو، لەهەمووشیان گەورەتر فێری هێمای گوێگرتن بوو، فێری ئەوەبوو کە چۆن بەبێ هەڵچون، بە بێ مەرام ، بەبێ

حیکمەتو پرسو ڕایەکی پێشینە گوێ بگرێت بۆ دڵێکی دامرکاو و ڕۆحێکی کراوەو چاوەڕوان.

لەگەڵ ڤاسیوڤیدا لە کەماڵی خۆشبەختیدا دەژیا، بەدەگمەن وشەیەکیان دەگۆڕیەوە، ئەوەشی پەیوەندی بە وشەوە هەبووایە بە دیقەتەوە هەڵیان دەبژارد، ڤاسیوڤیدا دۆستی وشەکان نەبوو، سیدهارتاش بەدەگمەن دەیتوانی ناچاری بکات بۆ قسەکردن.

کاتێک سیدهارتا پرسی: چۆن نهێنی نەبوونی کات لە ڕووبارەوە فێربوی؟

زەردەخەنەیەکی گەورەی ڕوخساری ڤاسیوڤیدای ڕۆشنکردەوەو ڤاسیوڤیدا وتی: بلێ.. سیدهارتا، ئایا مەبەستی تۆ ئەوەیە کە ڕوبار لەیەک کاتدا لەهەموو شوێنێکدا هەیە؟ لەسەرچاوەدا، لە دەمی دەریادا، لە تاڤگەکاندا، لە جوگەلەکاندا، لە ئۆقیانوسو کێوەکاندا، واتە بەتەواوی لە هەموو جێگایەکدایە؟ دەتەوێ بڵێی لای ڕووبار تەنها "ئێستا" بونی هەیە، سێبەرێک لە ڕابردو لە ئایندەی بەسەرەوە نیە؟ سیدهارتا وتی: بەڵی هەر هەمان مەبەستم هەبوو، ئەو کاتەی بەم نهێنیە ئاشنابوم، ژیانی خۆمم خستە بەر لێکۆڵینەوەو بینیم ژیانی منیش وەکو ڕووبار وایە، سیدهارتای منداڵو سیدهارتای لاو و سیدهارتای پیر تەنها لە سێبەرەکاندا لەگەڵ یەکدا جیاوازن، ئەگین لە ڕاستیدا جیاواز نین لەیەکتر، چرکە ساتەکانی ژیانی ڕابردوی سیدهارتاش لە ڕابردوودا نەبوون، هەروەها مەرگو گەڕانەوە بۆ بەرهمەن بوون لە ئایندەدا نیەو نابێت، هیچ شتێک نەبووە هیچ شتێکیش نابێت، بۆهەر شتێک ئێستایەکو واقیعێک بونی هەیە.

سیدهارتا لەوپەڕی شادمانیەوە قسەیدەکرد، دۆزینەوەی ئەو نهێنیە





زۆر خۆشنودی کردبوو، دەیوت: ئایا غەمو مەینەت هەمووی بەشێک نیە لە زەمەن؟ هەروەها ئەشکەنجەو بێزاریو ترس هەمووی ناکەوێتە ناو زەمەنەوە؟ ئەی ئەو کاتەی کە زەمەن کۆنترۆڵ دەکرێت، یان کاتێک دەخرێتە پەراوێزەوە هەموو مەینەتو گرفتەکانی لەناو ناچن؟

سیدهارتا لە ئەوجی دڵخۆشیدا قسەیدەکردو ڤاسیوڤیداش گوێی بۆ گرتبوو، بە زەردەخەنەیەکی پڕلە ڕەزامەندیەوە سەری بۆ ڕادەوەشاند.

دەستی خستەر سەر شانی سیدهارتاو ئیشەکەی خۆی دەسپێکردەوە.

جارێکی تر لە وەرزی باراندا، لەو کاتەدا کە ئاوی ڕووبارەکە لە هەڵچوندا بوو زیادی کردبوو ڕووبار بەتوندی دەخرۆشا، سیدهارتا وتی: ئەی دۆستی من، ئایا ئەوە ڕاست نیە کە ڕووبار دەبێتە خاوەنی دەنگو ئاوازە جیاوازەکان؟ مەگەر ئەو ئاوازە تێکەڵ نەبووە بە دەنگی پاشاکان، نەعرەتەی پیاوانی جەنگاوەر، هەڵچونی گا، ئاوازی باڵندەی شەو، ناڵەی ژنی دووگیانو دووکەڵی ئاهی پیاوی غەمبار، هەروەها لەگەڵ چەندین ئاوازی تردا تێکەڵنەبووە؟

ڤاسیوڤیدا سەرێکی ڕاوەشاندو وتی: ڕاستە بەو جۆرەیە، دەنگی هەموو بونەوەرەکان لەو ئاوازەوە دێتەدەرێ.

سیدهارتا بەردەوامی بەقسەکانی داو وتی: ئایا دەزانی کاتێک کە خۆشبەختی دەسکەوتو ئێمە لەیەک ساتدا دەیان هەزار ئاوازی ئەومان بیست، ئەو کاتە ڕووبار چی دەڵێت؟

ڤاسیوڤیدا بەوپەڕی خۆشحاڵیەوە پێکەنیو چووە لای سیدهارتاو وشەی پیرۆزی ئوم ی بەگوێدا چرپاند، ئەمەش ئەو وشەیە بوو کە

سیدهارتا بیستبووی.

پاش ماوەیەکی کەم زەردەخەنەکەی سیدهارتاش وەک زەردەخنەکەی بەلەمەوانەکەی لێهات، بەهەمان ئەندازە ڕۆشنو پڕلە بەختەوەریو لەنێوان هەزاران تاڵی چین چینی پڕ لە نوری پیریدا گیرسابوەوە، گەشتیاران کاتێک ئەم دوو بەلەمەوانەیان پێکەوە دەبینی، پێیان وابوو هەردوکیان بران، زۆربەی شەوەکان پێکەوە لەسەر شالقی درەختێک لەکەناری ڕووباردا دادەنیشتن، هەردوکیان بە بێدەنگی گوێیان لە ڕووبار دەگرت، ئەو ئاوە سازگارە بۆ ئەوان ئاو نەبوو، بەڵکو دەنگی ئەو ڕووبارە ئاوازی ژیانو جەنجاڵی بوونو ئەبەدیەت بوو، هەندێک جار وارێک دەکەوت، کە هەردوکیان بیریان لەیەک شت دەکردەوە، وەک گفتوگۆی ڕۆژی ڕابردویان، یان لە دەردی سەریو چارەنوسو بارودۆخی ئەو گەشتیارانەی کە زەینی هەردوکیانی داگیرکردبوو، یان لە مەرگ، یان لە سەردەمی منداڵی، ئەگەر لەیەک کاتدا ڕووبار شتێکی پێ بگوتنایە، لە یەکتریان دەڕوانیو هەردوکیان بیریان لەیەک شت دەکردەوە، هەروەها پێکەوە دڵخۆش بون بەوەی کە یەک وەڵامی هاوبەشیان هەبوو لە بەرامبەر پرسیارێکدا.

شتێک وەک نوور لەو دوو بەلەمەوانەدا دەدرەوشایەوەو گەشتیارەکان هەستیان پێدەکرد، زۆر جار ئەو حاڵەتە ڕوویدەدا، کاتێک گەشتیارێک لە ڕوخساری ئەو دوانەی دەڕوانی، پاش ئەوە یەکسەر چیرۆکی دەورانی ژیان خۆی دەگێڕایەوەو دانی بە گوناهەکانیدا دەناو داوای پەندو ئامۆژگاریدەکرد، زۆر جار ئەوە ڕوویدەدا کە کەسێک دەیخواستو داوای یارمەتیدەکرد کە شەوێک





لەگەڵیاندا بمێنێتەوەو گوێ لە ئاوازی ڕووبار بگرێت، هەروەها خەڵکانێکی زۆر بەو خەیاڵەوە دەهاتن بۆ لایان کە ئەمانە دووپیاوی حەکیمن، یان دوو جادووگەرن، یان دوو پیاوی پیرۆزین.

ئەو کۆمەڵە خەڵکە پرسیار گەلێکی زۆری دەکرد، بەڵام وەڵامێکیان نەدەبیستو کەسایەتی جادووگەر، یان بوونەوەرێکی پیرۆزیان لەوانەدا نەدەبینیەوە، بەڵکو وەک دوو پیرەمێردی سادە بەر چاو دەکەوتن، یان وەک لاڵو گەمژە سەیر دەکران، ئەو گروپە بە دڵسافی ئەوخەڵکانە پێدەکەنین کە گرنگیدەدەن بەو جۆرە پڕوپاگەندانە. ساڵانێک تێپەڕیو هیچ یەکێک لەوانە، ڕۆژانی ڕابردوویان نەخستە بەر باسو بیرکردنەوە، تاوەکو ڕۆژێک چەند ڕەبەنێک کە شوێنکەوتووی بوودابون هاتنە ئەوشوێنەو داوایانکرد کە لە ڕووبار بپەڕنەوە، دوو بەلەمەوانەکەش لەوانەوە بیستیان، کە بەپەلە دەچن بۆ بینینی مامۆستا مەزنو حەکیمەکەیان، چونکە ئەو هەواڵانە بڵاو ببوەوە کە بودای مەزن بەسەختی نەخۆشەو بەوزووییە نزیکی مەرگ بوەتەوەو دواهەمین هەناسەی ژیانی فانی دەداتو دەچێتە ئەبەدیەتەوە، دوای ئەو گروپە دەستەیەکی تر ڕەبەن هاتنو دوای ئەوانەش کۆمەڵێکی ترو زۆربەی گەشتیارەکانو خەڵکی دەربارەی بوداو نەخۆشیو مەرگی نزیکوەختی ئەو قسەیاندەکرد.

بەو شێوەیە خەڵکی لەهەموو لایەکەوە وەک ئەوەی بەمەبەستی دانانی تاجی پاشایەتی یان بۆ ڕێو ڕۆشتنی سەربازی کۆببنەوە، بۆ ئەو مەبەستەش وەک کورەی هەنگ یان وەک ئەو پوشو پەڵاشەی کە موگناتیسێک بەدەوری خۆیدا کۆیدەکاتەوە ئاوا دەڕۆشتن بۆ ئەوەی بگەنە ئەو جێگەیەی کە بودای مەزنی لێیەو لەسەر چرپای

مەرگ ڕاکشاوە، دەرۆشتن تاوەکو لەو شوێنە ئامادەبن کە بڕیاری مەرگی ئەو پیاوە مەزنو بێ وێنەیەی تێدا جێبەجێ دەکرێت، ئەو پیاوەی کە دڵسۆزی سەردەمەکەی خۆیو سومبولی ئەبەدەیت بوو، سیدهارتا لەو کاتەدا بیری لەو پیاوە پیرۆزە دەکردەوە کە بەدەنگی هەزاران کەسی خرۆشاندبوو، ئەو دەنگەی ڕۆژگارێک سیدهارتا خۆی بیستبووی، بیری لەو ڕوخسارە پیرۆزەی دەکردەوە کە هەمیشە بە حورمەتێکی زۆرەوە لە یادەوەریدا مابوو لە خەیاڵیدا بوو، سیدهارتا بیرەوەریەکانی ئەوی زۆر خۆشدەویستو ئازیزبون لە لای، ئەو قسانەی کە لە سەردەمی لاویدا بەو پیاوە حەکیمو تاقانەیەی وتبوون، ئەو ڕێگایەی کە لەپێناو ڕزگاریدا گرتبویەبەر، هەموو ئەوانە دەهاتنەوە یادیو بیری لێدەکردنەوە، لای ئەو هەموو ئەو قسانە گرانبەهاو مەزنو بایەخداربوون، ڕۆژگارێکی دووردودرێژ کە وا هەستیدەکرد جیاواز نیە لە گۆتاما، بەڵام لەهەمانکاتدا نەیدەتوانی ڕێنماییەکانی پەسەندبکات، نەخێر، گەریدەیەکی بیرکەرەوەی ڕاستەقینە لەکاتێکدا کەبە ڕاستی عەودالی شتێک بێت، ناتوانێت هیچ جۆرە ئامۆژگاریو ڕێنماییەک وەرگرێت، بەڵام کاتێ ئەوەی بەدەستهێنا کەبەدوایدا دەگەڕێتو پێیگەشت، ئەوکاتە دەتوانێت دەربارەی هەمووشتێک بیروو بۆچوونی خۆی بخاتە ڕوو، دەربارەی هەموو شتێکو هەمووئامانجێک داناو لێزان بێت، هیچ شتێکیش ناتوانێت لەوهەزاران کەسەی جیابکاتەوە کە بۆئەبەدیەت دەژینو پەنا بۆ زمانێکی بەهەشتی دەبەن.

لەوسەروبەینەدا کەهەموو کەس دەچوو بۆ زیارەتی بوودا، بۆزیارەتی ئەوپیاوە حەکیمو بێ هاوتەیە، ئەو کەمالەش کەوتەڕێ کە





ڕۆژانێک خۆشترینو جوانترین ئافرەتی خەوتنو جوتبوون بوو، ماوەیەکی زۆربوو دەستی هەڵگرتبو لەو پیشەیەی جارانیو ماڵو باغەکەی خۆی بەخشیبوو بە ڕاهیبەکانی بووداو خۆی خستبوە پەناگای ماڵۆچکەی پەندو ڕێنماییەکانی ئەو حەکیمەمەزنەوەو چووبووە ڕیزی ژنە چاکەکارەکانی ئەو دەستەیەوە کە دەچوونە زیارەتی بوودا، بەبیستنی نزیکبوونەوەی سەرەمەرگی بوودا، کەماله عابایەکی سادەی پۆشیو لەگەڵ کوڕەکەیدا بۆ زیارەتی ئەو حەکیمە بەهاداره بەپێ کەوتنە ڕێو لەڕێگادا گەشتن بە ڕووبارێک، مناڵەکەی هێندە ماندوو شەکەت ببوو دەیویست بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، دەیویست نانێک بخواتو بحەوێتەوە، زۆر سەرەڕۆو چەقاوە سووبوو، هەمیشە دەم بەگریان بوو، زۆربەی کاتەکان کەماله سەرقاڵی ئەوبوو ئارامی دەکردەوە، مناڵەکە خوی بەوەوە گرتبوو کە لەگەڵ مەیل ئارەزوەکانی خۆیدا ئیرادەی دایکی پەک بخات، کەماله مناڵەکەی تێر خواردن کردوو بەهێمنیو ئیسراحەت ئاگاداری بوو، مناڵەکە نەیدەزانی بۆچی دایکی بۆ زیارەتکردن بەو ڕێگە سەختو ناهەموووارەدا لەگەڵ خۆیدا دەیبات بۆ شوێنێکی نەناسراو و بۆ دیدەنی پیاوێکی پیرۆز کە لەسەرەمەرگدایە.

ئەو دوو ڕێبوارە ئەوەندە دوور نەبوون لەکوخەکەی ڤاسیوڤیداوە، سیدهارتای بچوکو مناڵ بەدایکی وت: ماندوەو دەیەوێت پشویەک بدات، کەماله خۆشی ماندوو بوو، سیدهارتا خەریکی خواردنی مۆزێک بوو، کەماله لەسەر زەویەکە دانیشتو چاوەکانی لێک ناو شلونەرم بوو، لەناکاو لەتاو ئازار هاوارێکی لێ بەرز بوەوە، مناڵەکە لەترسانا بەشێوەیەکی سامناک لەڕووخساری دایکی ڕوانیو بینی

ڕەنگی سپی بوەو ڕەشمارێک لەژێر جلەکانی کەماڵەوە هاتەدەرێ، مارەکە گەزتبووی، پاشان بەتەنیشتیا هەڵهاتو ڕۆشت، هەردووکیان بۆئەوەی خەڵکێک فریایان بکەوێت، زۆر بە پەلە دەڕۆیشتن‌و ئەوەندەش لەڕووبارەکەوە دوور نەبوون، کاتێک کەماڵە کەوتە سەر زەوی‌و لەوە زیاتر هێزو تینی ڕۆشتنی نەماو بێ هێزبوو، منالەکە بۆئەوەی کەسێک کۆمەکو هاوکاریان بکات بەدەنگی بەرز هاواریدەکردوو لەهەمانکاتیشدا دایکی لەئامێزگرتبوو ماچی دەکرد، کەماڵە هاوارێکی کردو هاوارەکە گەشتە گوێی ڤاسیوڤیدا، کە لە تەنیشت بەلەمەکەیدا وەستابوو، ڤاسیوڤیدا بە پەلە خۆی گەیاندە لایان‌و ژنەکەی گرتە باوەش‌و بردی بۆلای بەلەمەکە، منالەکەش خۆی گەیاندە لایان‌و بەزووی چوونە ئەو کوخەوە کەسیدهارتا لەوێ وەستابوو،و خەریک بوو ئاگری گەش دەکردەوە.

سیدهارتا یەکەمجار لەڕووخساری منالەکەی ڕوانی شتێکی دەهێنایەوەیاد، پاشان تەماشای کەماڵەی کرد کەلە باوەشی ڤاسیوڤیدادا بێهۆش بوو، یەکسەر ناسیەوە، ئەوکاتە زانی کە ئەومناڵە هی خۆیەتی‌و هەر ئەوەش بوو کەڕوخساری منالەکە شتێکی بیردەخستەوە، بۆیە دڵی سیدهارتا کەوتە لێدانێکی بەپەلە.

شوێنی مارانگازەکەیان شۆری، بەڵام برینەکەی ڕەش ببوو،و جەستەشی بەرە بەرە دەئاوساو دەرمانێکی وریاکەرەوەیان دایە کەمێک بەخۆیدا هاتەوە، کەماڵە لەسەر چرپاکەی سیدهارتا ڕاکشابوو، سیدهارتا سەرمانێک هێندەی خۆشدەویست بۆیە بەسەریا چەمابووەوە تێیدەڕوانی.

کەماڵە پێیوابوو خەو دەبینێ، زەردەخەنەیەکی کردو جارێکیتر





چاوی خستەسەر ڕووخساری مەعشوقەکەی‌و هێدی هێدی هاتەوە سەرخۆی، بۆشانسی کوڕە بچوکەکەی ئارامی لێبرا، سیدهارتا پێی وت: ئارام بە، ئەو لێرەیە، کەماڵە لەچاوەکانی سیدهارتای ڕوانی، هەرچەندە ئەو ژەهرە لەجەستەیدا بوو،و توانای قسەکردنی نەبوو، بەڵام بەزەحمەت وتی: ئازیزەکەم، تۆپیربووی، مووەکانت خۆڵەمێشی بوون، بەڵام هێشتا لەو سامانایە دەچی کە ڕۆژگارێک بێ جل‌و بەقاچە خۆڵاویەکانتەوە لەباغەکەدا هاتی بۆلای من، تۆ زیاتر لەو دەچی تاوەکو ئەو پیاوەی کە ماڵئاوایی لە کاماسڤاتی کرد، چاوەکانت هەر لەو چاوانەی جارانی ئەو سامانایە دەچن، منیش پیربووم، دەتوانیت بمناسیتەوە؟

سیدهارتا وتی: کەماڵە.. ئەی ئازیزەکەی من، من بەتیلە چاوێک تۆم ناسیەوە.

کەماڵە منداڵەکەی پیشانی سیدهارتاداو وتی: ئایا ئەوەشت ناسی؟ ئەوە منالی تۆیە، بەچواردەوری خۆیدا چاوی گێڕاو چاوی داخست، منالەکە دەستی کرد بەگریان، سیدهارتا منالەکەی خستبوە سەر ئەژنۆی خۆی، بەڵام لایبرد بۆ ئەوەی بگری، یاری بەپرچەکانی دەکرد، سەیری ڕووخساری منالەکەی کردوو دوعای براهمای بیرکەوتەوە. بەدەنگێک کەلە مۆسیقا دەچوو بەهێمنی ئەو دۆعایەی بەسەراخوێند کەلەمنالیەوە دەیزانی، ئەو وشانەی لەسەر دەمی منالی‌و لەرۆژانی ڕابردووەوە بۆ گەڕابوونەوە، لەوکاتەدا کە خەریکی دۆعا خوێندن بوو، منالەکە بێدەنگ بوو، بەڵام هێشتا شانەکانی دەلەرزین، پاشان خەوی لێکەوت، سیدهارتا خستیەسەر جێگاکەی ڤاسیوڤیدا، ڤاسیوڤیدا خۆی لەلای ئاگرەکەوە خەریکی برنج بژاردن

بوو، سیدهارتا سەیرێکی کردوو ڤاسیوڤیدا زەردەخەنەیەکی کرد، سیدهارتا بەهێمنی وتی: ئەو لە سەرەمەرگدایە، ڤاسیوڤیدا سەری راوەشاند، رۆشنایی ئاگرەکە لەروخسارە میهرەبانەکەیدا دەدرەوشایەوە.

کەماڵە جارێکی تر هاتەوەسەرخۆی، لەروخساریدا ئازارومەینەت دەخوێندرایەوە، سیدهارتا بەدەوری لێوەکانیداو لەسەر روخسارە رەنگ پەرپیوەکەیدا ئازارو مەینەتی بینی، هەروەها لەکەماڵی وردبینیو سەرنجدا، بەهێمنی ئەو ئازاراو مەینەتەی خوێندەوە، زۆر بەتاقەتەوە بەشداربوو لەو ئازارو میحنەتەدا، کەماڵە بەو حاڵەتەی زانی، نیگای کەماڵە نیگاکانی سیدهارتای دەخوێندەوە.

کەماڵە لەوکاتەدا سەیری دەکرد وتی: ئیستە دەبینم چاوەکانی تۆش گۆڕاون، بەتەواوی وەک خۆیان نەماون، چۆن بزانم تۆهێشتا سیدهارتای؟ تۆ سیدهارتای، بەڵام چیتر لەو ناچی.

سیدهارتا هیچی نەوت، بەبێدەنگی سەیری چاوەکانی دەکرد، کەماڵە پرسی: ئایا بەوەگەشتوی؟ ئاشتیو ئاسودەگیت دۆزیوەتەوە؟

سیدهارتا زەردەخەنەیەکی کردوو دەستی خستە سەردەستی کەماڵە، کەماڵە وتی: بەڵێ ، هەست بەوە دەکەم، منیش دەگەمە ئەو رزگاریە، سیدهارتا دەنگێکی لێوەهات لەژێرلێوەوە وتی: ئایا تۆ پێی گەشتوی؟، کەماڵە راستەوخۆ سەیری ئەوی دەکرد.

مەبەستی کەماڵە لەو سەفەرەیدا ئەوە بوو، کە تەماشایەکی رووخساری گۆتامای بکاتو لەخۆشەویستی ئەو بەشداربێت، بەڵام لەباتی ئەو سیدهارتای دۆزیبوەوە، بەڵام ئەوەش هەر بەو ئەندازە خۆش بوو، دەیویست بەسیدهارتا بڵێت: کە.... بەڵام چیتر زمانی لەگۆ





کەوتبوو، بەبێدەنگی لە سیدهارتای روانی، سیدهارتاش بینی کەچیتر شەوقی ژیان لەچاوەکانیدا کزبووە.

لەوێ دواهەمین لەرزین ماڵئاوای لەجەستەی کردوو پەنجەکانی سیدهارتا چاوەکانی کەماڵەیان لێکنا.

سیدهارتا ماوەیەکی زۆر لەوێ دانیشتو لەرووخساری زەردی ئەو راماو بەرامبەر دەمولێوە پەژموردەکانی واقی ورما، ئەوەی بیرکەوتەوە کەسەردەمانێک ئەو لێوانەی چواندبوو بە هەنجیرێک کە تازە دەمی کردبێتەوە، ماوەیەکی زۆر لەو چرچو لۆچو رووخسارە رەنگ پەرپیوە راما کە سومبولی مەینەتو ماندوویەتی بوو. رووخسار خۆشی هەربەوشێوەیە سپیو بەوشێوەیە بێ رۆح بینیەوە، لەهەمانکاتیشدا رۆخساری خۆیوو کەماڵەی بە جوانیو بەلێوی سورو چاوی رۆشنەوە بینی کە رازی بوو لە ئستاو تەواوی بوون، لەو ئانو ساتەدا زیاد لەهەموو کاتێکیتر هەستی بەنەمری ژیانو ئەبەدیەتی هەموو چرکە ساتەکان کرد، لەوشوێنەی خۆی هەستاو ڤاسیوڤیدا ئەو برنجەی خستە بەردەمی کەبۆی ئامادەکردبوو، بەڵام پێی نەخوراو دەستی لێنەدا، لەئاغورەکەدا ، لەوشوێنەی کە گەوڕی بزنەکانیان بوو، برێک کایان کۆکردەوەو شوێنێکیان لەشێوەی چرپادا دروستکردو ڤاسیوڤیدا رۆشتە ئەوێ بۆ حەوانەوە، بەڵام سیدهارتا بەدرێژای شەو لەدەرەوەی کوخەکە دانیشتو گوێی لەرووبار گرتو لەرابردوودا نوقم بوو، لەهەمان کاتیشدا رۆژەکانی ژیانی کەماڵەشی گەمارۆدابوو، سات بەسات دەوەستاو دەرۆشتە دەرگای کوخەکەو گوێی لەدەنگی هەناسەدانی مناڵەکەی دەگرت کە لەوێ خەوتبوو.

بەیانی زوو، بەرلەوەی خۆرهەڵبێت، ڤاسیوڤیدا لە ئاخورەکە هاتە

دەریَو چووەلای دۆستەکەیوو وتی: تۆ نەخەوتووی؟

–نەخێر، ڤاسیوڤیدا من لێرەدا دانیشتبوومو گوێم لەڕووباردەگرت، زۆر شتی پێوتم، ڕۆحمی پڕکرد لە ئەندێشەمەزنەکانو لەبیری یەکبوونی شتەکان.

–ئەی سیدهارتا، تۆ زۆر ڕەنجت داوەو ماندوبووی، بەڵام دەبینم هێشتا دڵی تۆ خەمو خەفەت پەی پێنەبردووە.

–نەخێر، ئەی دۆستی من، بۆچی دەبێت من غەمبار بم؟ منێک کەدەوڵەمەندو خۆشحاڵ بووم، ئیستە دەوڵەمەندترو ئاسودەتر بووم، منالەکەمیان پێ بەخشیمەوە.

–منیش خۆشحالم بەهاتنی منالەکەت، بەڵام هەنوکە ئەی سیدهارتا، بهێڵە بچینەوە سەر کارەکانمان، ئەمڕۆ دەبێت کۆمەڵەکارێکی زۆر ئەنجام بدەین.

کەماله، لەسەر چرپایەک مرد کە ژنەکەی منیش هەر لەو شوێنەدا ماڵئاوایکرد، پێویستە وشکەدار کۆکەینەوە بۆسوتاندنی تەرمەکەی، برێک وشکەدار دانێین لەو شوێنەدا کەمن ڕۆژگارێکی دێرین تەرمی ژنەکەی خۆمم تیاسوتاند.

لەوکاتەدا کە سیدهارتای منال لە خەودابوو، ڕۆشتن کۆمەڵێک وشکەداریان کۆکردەوە بۆ سوتاندنی تەرمەکە.

***





# گوڕ

سیدهارتای بچوک بەترسو شیوەنو گریانەوە بەشداریکرد لەمەراسیمی سوتاندنی تەرمەکەی دایکیدا، هەستی بەترسو نیگەرانی دەکرد کاتێک گوێی لە سیدهارتا دەبوو کە بە کوڕەکەی بانگی دەکاتو ڤاسیوڤیداش بۆ ناو کوخەکەی بانگی دەکات، ماوەیەک بە سیمایەکی بێڕەنگەوە لەسەر گردۆڵکەی مردوەکان دانیشت، وادیاربوو سەیری شوێنە دوور دەستەکان دەکات.

بەدڵێکی داخراوەوە لەجەنگو کۆششێکی بەردەوامدابوو دژی چارەنوسی خۆی.

سیدهارتا لەگەڵ کوڕەکەیدا ڕەفتارێکی جوانو لەسەرخۆی هەبوو، بەچاوی ڕێزەوە لەغەمو نیگەرانیەکانی دەڕوانیو بە کەسێکی تەنیای دەزانی، سیدهارتا لەوە تێگەیشت کە کوڕەکەی نایناسێتو ناتوانێت وەک باوکێک خۆشی بوێت، هەروەها حاڵی بوو لەوەی کە ئەو منالە یانزە سالە، منالێکی نازدارەو خۆشەویستی دایکی بوەو بە نەریتی دەوڵەمندەکان گەورە بووەو خوی گرتووە بە خواردنی گرانبەهاو پێخەفی نەرمو فەرمان بەسەر خزمەتکاراندا، سیدهارتا لەوە تێگەیشت ئەو منالە ناسکو غەمبارو نازپەروەرە، ناتوانێت وا زوو خوو بەو ژینگە هەژارو نامۆیەوە بگرێت، چیتر نەیدەخستە ژێر فشاری خۆیەوە، بەڵکو لەپێناویدا زیاتر کاریدەکردو هەمیشە باشترین پارووی بۆ هەڵدەگرتو ئومێدەوار بوو بەهێمنیو بەسەبرەوە خۆشەویستی

ئەو بۆ خۆی ڕابکێشێت.

لەو ڕۆژەی مناڵەکەی هات بۆ لای، سیدهارتا خۆیی بەکەسێکی خۆشبەختو دەوڵەمەند کەوتە بەر چاوو، بەڵام ماوەیەک تێپەڕیو مناڵەکەی هەر لە هەمان حاڵەتی بێ ئارامیو بەدڕەفتاریو نارەزایدا مایەوە، لەو کاتانەدا کە خۆی بە گەورەو خودپەرست دەزانیو یاخی دەبوو، هیچ کارێکی نەدەکردوو ڕێزی خەڵکانی بەساڵاچووی نەدەگرتو میوەو درەختەکانی ڤاسیوڤیدای دەڕنیو فڕێیدەدا، ئەوکاتە سیدهارتا تێگەیشت کەبەهاتنی مناڵەکەی ئاشتیو ئارامیو خۆشبەختی ڕووی تێنەکردووە، بەڵکو هەموو چارەنوسی غەمو مەینەتو ئازارە.

بەڵام سیدهاتا هەر خۆشیدەویستو قەرەبووی ئەو غەمو مەینەتو زەحمەتی عەشقەی بەو خۆشبەختیو ئارامیە دەدایەوە کە بە بێ ئەو بەرجەستەدەبوو، لەو کاتەوە سیدهارتای بچوک هاتە کوخەکەیانەوە ئەو دوو پیرەمێردە کارەکانیان دابەشکرد، ڤاسیوڤیدا کاروباری مەلەوانی گرتە ئەستۆو سیدهارتاش لەبەر ئەوەی زیاتر لەگەڵ منداڵەکەیدا بێت کاری ناو کوخەکەو کێڵگەکانی گرتە ئەستۆ، چەند مانگێک سیدهارتا لە چاوەڕوانیدا مایەوەو ئومێدەواربوو ڕۆژێک مناڵەکەی توانای تێگەیشتنی حاڵەتە دەرونیەکانی ئەوی هەبێتو ئەو عەشقەی قەبوڵ بکاتو دواتریش لە جێگەی دۆستەکەی خۆی دایبنێ، ڤاسیوڤیدا لەم خاڵە ئاگادار بوو، هەروەها ئەویش بە بێدەنگی لە چاوەڕوانیدا بوو، ڕۆژێک سیدهارتای بچوک بە ڕەفتاری دزێوو سەرکێشیو سەرەڕۆیی خۆیەوە باوکی زۆر نارەحەتو پەرێشان کرد، هەردوو سەتڵی برنجەکەی شکاند، ڤاسیوڤیدای دۆستی چرپاندی بە گوێیدا وتی: لەمن ببورە، من وەک دۆستێک قسەت لەگەڵ دەکەم،





دەبینم تۆ زەحمەتدەکێشیو پەشێوحاڵی، ئەی دۆستی من، ئەو مناڵە هەم تۆ نیگەران دەکاتو هەم منیش، ئەو باڵندە جوانو چکۆلەیە بە ماڵێکی ترو ژیانێکی تر ڕاهاتووە، ئەو وەکو تۆ بەهۆی هەستکردن بە نەفرەتو بێزاری لەماڵو سەروەتو سامان لەشار هەڵنەهاتووە، بەڵکو هەموو ئەو شتانەی بە پێچەوانەی ویستی خۆیەوە بەجێهێشتوە، من هەزاران جار ئەوەم لە ڕووبار پرسیوە، ئەی دۆستی من، هەمیشە ڕووبار بەمنو تۆ پێکەنیوە، لە نادانیو نەزانی ئێمە لە پێکەنیندا هاتوتە لەرزین، ئاو بەستراوە بە ئاوەوەو جوانیش بە جوانیەوە، مناڵەکەی تۆ لەم شوێنەدا خۆشبەخت نابێت، تۆ ئەوە لە ڕووبار بپرسەو بزانە چیت پێدەڵێ.

سیدهارتای ستەمدیدە تەماشای ڕوخساری میهرەبانی پیرەمێردەکەی کردوو هەزاران چرچو لۆچی تێدابینی، کە حیکایەتی خۆشنودی ناخی ئەو بوون، سیدهارتا بە هێمنیەوە وتی: چۆن دەتوانم لێی جیابمەوە؟ ئەی دۆستی من کەمێک بوارم بدە، من لەپێناوی ئەودا لە جەنگدامو هەوڵدەدەم پەی بەدڵی ئەو بەرم، من بە عەشقو حەوسەڵەو سەبر بەدەستی دەهێنم، ئەم ڕووبارەش ڕۆژێک دێ قسە بۆ ئەو دەکات چونکە ئەویش بۆ ئەم مەبەستە بانکراوە بۆ ئێرە.

زەردەخەنەکەی ڤاسیوڤیدا گەرمتر بوو وتی: بەڵێ ئەویش بۆ ئەم شوێنە بانکراوە، ئەویش پەیوەندی هەیە بە ژیانی جاویدانیەوە، بەڵام ئایا منو تۆ دەزانین ئەو بانکراوە بۆ ئەوەی لە چ ڕێگایەکەوە بڕوات؟ بەچ ڕێگایەکدا دەڕوات؟ چ کارێک ئەنجام دەدات؟ چ زەحمەتێکی لە پێشدایە؟ زەحمەتەکانی ئەویش کەمنابن، ئەو دەبێتە خاوەنی دڵێکی ڕەقو لەخۆبایی، پێدەچێت زیاتر زەحمەت بکێشێ، هەڵەی زۆرتر

بکاتو ستەمی زیاترو گوناهی زیاتر بکات، بڵێ.. ئەی دۆستی من، ئایا تۆ منداڵەکەت پەروەردە دەکەی؟ ئایا ئەو فەرمانەکانت جێبەجێ دەکات؟ ئایا تۆ لێی دەدەی یاخود ئازاری دەدەیت؟

سیدهارتا وتی: ئەی ڤاسیوڤیدا، نەخێر.. هیچ یەکێک ئەو کردارانە ناکەم.

ڤاسیوڤیدا وتی: من ئەوەم دەزانی  کە تۆ توندوتیژ نابی لەگەڵیداو ئازاری نادەی، فەرمانی بەسەرا نادەی، چونکە تۆ دەزانی مهرەبانی لە توندوتیژی بەهێزترە، تۆ دەزانیت کە ئاو لەبەرد بەهێزترو عەشق لە زۆرداری بالاترو مەزنترە، زۆر باشە، من سوپاسی ئەو جوانیەی تۆ دەکەم، بەلام کە تۆ ئازاری نادەیتو توندوتیژ نابیت بەرامبەری ئەی کە بەخۆشەویستی خۆت زنجیری دەکەیت هەڵەی تۆ نیە؟ مەگەر تۆ هەموو ڕۆژێک بە خۆشەویستیو سەبووری خۆت، زیاتر ئەو خەجاڵەت ناکەیتو دەرەنجام گرفتئامێزتری ناکەیت؟ ئەی تۆ ئەو منالە ناز پەروەرە ناچار ناکەیت کە لەیەک شوێنداو لەگەڵ دوو پیرە مێرددا بژی  کە خواردنیان مۆزەو تەنانەت برنج بەلایانەوە زۆر گرنگەو بیرو بۆچونیان لەگەڵ بیرکردنەوەی ئەودا نایەتەوە، دڵیان پیربوەو تەنانەت لێدانی دڵیشیان بە شێوازێکی ترە؟ ئایا ئەو منالە لەگەڵ ئەم هەموو شتانەدا نەکەوتوەتە ژێر فشارەوەو سزانادرێت؟

سیدهارتا لەحاڵەتی گێژیو سەرسامیدا سەیری زەوی کردووو وتی: بە بڕوای تۆ دەبێت چی بکەم؟

ڤاسیوڤیدا وەلامی دایەوە: بیبەرەوە بۆ شارو بیگەڕێنەرەوە بۆ ماڵی دایکی، هێشتا خزمەتکارەکان لەوێن، بیسپێرە بەوان، ئەگەر کەس نەبوو بیدە بە فێرخوازێک، نەک تەنها لە پێناوی فێربوندا، بەڵکو بۆ





ئەوەی بتوانێت لەگەڵ هاوتەمەنەکانی خۆی کوڕانو کچانی تر ببینێتو لە دنیایەکدا بژی کە پەیوەندی بەوەوە هەبێت، ئایا هیچ بیرت لەو حاڵەتانە نەکردوەتەوە؟ سیدهارتا وتی: تۆ ناودڵی من دەبینی، من زۆرجار بیرم لەوە کردۆتەوە، بەلام ئەو کە ئەوەندە دڵڕەق بێت دەتوانێت بچێتە ئەو جیهانەوە؟ مەگەر ئەو خۆی بە گەورەتر نەزانیوە لەهەموو شتێک، لە چێژوو دەسەلاتدا نوقم نەبووەو هەڵەکانی باوکی دووبارە ناکاتەوە؟ مەگەر ئەو بەتەواوی لەیاری سانسارا دا خۆی لەدەست نادات؟ بەلەمەوان جارێکی تر زەردەخنەی کردوو، قۆڵی سیدهارتای بەتاسەوە گوشیو وتی: ئەی دۆستی من، بەتایبەت ئەوە لە ڕووبار بپرسە، گوێی لێبگرەو پێبکەنە، بیر لەوە دەکەیتەوە کە تۆ لە پێناوی پاراستنی منالەکەتدا کەوتوویتەتە ناو ئەو گوناهانەوە؟ ئایا تۆ دەتوانی منالەکەت لەیاری سانسارا بپارێزی؟ چۆن؟ بە پەروەردەکردن یان بەنوێژ کردنو دوعا، یان بە ئامۆژگاریکردن؟ ئەی دۆستی ئازیزم، ئەی تۆ ڕۆژگارێک حیکایەتی پەروەردەو فێرکردنی سیدهارتای براهمازادەت بۆ نەگێڕامەوە؟ چ کەسێک سیدهارتای سامانای لە سانساراو گوناهو کینەو کاڵفامی پاراست؟ ئایا نوێژوو دوعاکانی باوک، ئامۆژگاریەکانی مامۆستا، زانستو وردبینی خۆی توانیان بیپارێزن؟ کامە باوک، کام مامۆستا توانیویەتی  ئەو لە ژیانی خۆی بکاتو پابەند بوونی بە دنیاوە قەدەغە بکات تاوەکو نوقمی گوناە نەبێتو ئەو شەرابە تەڵخە نۆش نەکاتو ڕێگەی خۆی بدۆزێتەوە؟

ئەی دۆستی من، ئایا پێت وایە دەتوانی کەسێک جیابکەیتەوە لەو بنەماو ڕێگایە؟

چونکە ئەوە منالّی تۆیە، دەتەویّ مەینەتو ناڕەحەتیو ئازارو نائومێدی نەبینیت؟ بەلاّم دەزانی ئەگەر لەپێناوی ئەودا سەد جاریش گیانبدەیتو بمریت هێشتا نەتتوانیوە بچوکترین گۆڕانکاری بکەی لە چارەنوسیدا؟

ڤاسیوڤیدا هیچکاتێک بەو ئەندازەیە قسەینەکردبوو، سیدهارتا لە کەماڵی دۆستایەتیەوە سوپاسی کردوو بە دڵتەنگیەوە ڕۆشتەوە کوخەکەی، بەلاّم نەیتوانی خەوی لێبکەوێت، ڤاسیوڤیدا شتێکی نەوتبوو کە سیدهارتا خۆی نەیزانیبێت، بەلاّم سیدهارتا ئەو عەشقە بێئەندازەی کە هەیبوو بۆ منالّەکەی، بەهێزترو پتەوتر بوو لە حیکمەتەکانی، لەوە دەترسا منالّەکەی بدۆڕێنێ، ئایا هیچ کات ئەوە ڕویداوە کە سیدهارتا بەو ئەوندازەیە دلّی بۆ کەسێک بکاتەوەو ئەوەندە کوێرانە کەسێکی خۆشویستبێت؟ خۆشەویستیەکی تێکەلاّو بە ئازارو نائومێدیو لە هەمانکاتیشدا ئەوەندە دلّی خۆشبێت؟.

سیدهارتا نەیدەتوانی ئامۆژگاری دۆستەکەی وەرگرێت، نەیدەتوانی دەست لە منالّەکەی هەلّگرێت، قەبولّیدەکرد منالّەکەی فەرمانی بەسەردا بداتو ڕێزی لێنەگرێت، سیدهارتا بەبێدەنگی ئارامیبوو، و دانی بەخۆیدا گرتبوو،و لە چاوەڕوانیدا بوو، هەموو ڕۆژێک بەردەوامی دەبەخشی بەو کێشمەکێشە لەپێناو بێدەنگیو دۆستایەتیدا، ڤاسیوڤیداش بێدەنگ بوو، لەکەماڵی خۆشەویستیو هوشیاریدا دانی بەخۆیدا دەگرتو لە چاوەڕوانیدا بوو، ئەوانە هەردووکیان خواوەندی سەبرو ئارامگرتن بوون، لەو کاتانەدا ڕوخساری منالّەکەی ڕوخسارو سیمای کەمالەی وەبیردەهێنایەوە، بیریکەوتەوە ڕۆژێک کەمالە پێی وتبوو: تۆ ناتوانی خۆشەویستت





هەبێت، ئەو خۆشی بڕوای بەم قسەیەی کەمالە هەبوو، لەوساتانەدا کە خۆی لە شێوەی ئەستێرەکانا دەبینیو بونەوەرەکانیتری جیهانیشی بە گەلاّی وەریووی درەختەکان دەزانی، بەلاّم لەهەمان کاتدا ئەوەشی بیرکەوتەوە، کەلە قسەکانی کەمالەدا ئاوازێکی سەرزەنشتکاری دەبیست.

دروست وابوو، سیدهارتا هیچ کاتێک لەناو کەسیترا ئەوەندە خۆی وننەکردبوو، و خۆی بە فەرامۆشی نەسپاردبوو، هیچ کاتێک ئەوەندە دێوانەو عاشق نەببوو لەپێناو کەسێکی تردا، ئەو توانای ئەم جۆرە کارەی نەبوو، بە بڕوای ئەو ئەمە گەورەترین جیاوازیەکە لەنێوان خۆیوو خەلّکی سادەدا هەیە، بەلاّم لەوکاتەوە کە منالّەکەی هاتبوو بۆ لای، لەو شوێنەدا خۆی توشی ئازاری خۆشەویستیەک ببوو وەک ئازاری خەلّکانی سادە، دێوانەو سەرگەردان گرفتاری عەشق بوو، بەو جۆرەو بەدرێژایی ئەو ماوەیە بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا بە ئەزمونکردن، لە بەهێزترینو سەمەرەترین سۆزو خۆشەویستی تێگەیشت، ئێجگار لە مەینەتدا بوو، بەدەستیەوە دەینالاّند، بەلاّم لە هەمانکاتیشدا خۆشحالّ بوو، لە لایەکی ترەوە خۆی بە توانتر دەزانی، هەستیدەکرد ئەو خۆشەویستیە، ئەو عەشقە کوێرانەیەی کە هەیەتی بۆ منالّەکەی، سۆزێکی تەواو مرۆڤانەیەو وەک جۆرێک لە "سانسارا" یاخود وەک کانیەکی ئاشوفتە لە ئاوە قولّەکان دەیبینی، لەهەمان کاتیشدا پێی وابوو کە ئەو سۆزو خۆشەویستیەش بێ نرخ نابێتو بە بەشێکی پێویستی دەزانیو دەیبینی لەڕۆحی خۆیەوە هەلّقولاّوە، ئەو هەستکردنو ئازارو سۆزو مەینەتیە دەبێت هەمووی بە ئەزمونکردن بناسرێتو تێی بگەین، لەو

کاتەدا کوڕەکەی، سیدهارتای ناچاردەکرد کە بەردەوام بێت لەسەر ئەو دێوانەیی‌و سەر شێتیەی، سدەیخستە مەینەتەوەو سستو لاوازیدەکرد، شتێکی لە باوکیدا نەدەبینیەوە کە جێگەی سەرنجی ئەوبێت، یاخود ترسێک بخاتە دڵیەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو مناڵە وەک پیاوێکی باش‌و میهرەبان‌و پیرۆزو چاکەکار سەیری باوکی دەکردو دەیبینی، بەڵام ئەمانە ئەو خەسڵەتانە نەبوون کە لەسەر ئەو کاریگەربن، دەیبینی باوکی، بەو جۆرە ژیانە بێزارو بێ تاقەتی دەکات، سەرباری ئەوەش کاتێک کە بەبێ ئەدەبیەوە وەڵامی باوکی دەدایەوە، باوکی زەردەخەنەی بۆ دەکرد، ئەگەر هەڕەشەیەکی بکردایە باوکی بە دۆستایەتی پاداشتی دەدایەوە، هەرکاتێ عەجولی‌و سەرەڕۆیی بکردایە، ئەو بە میهرەبانیەوە وەڵامی دەدایەوە، بەبڕوای ئەومناڵە ئەمانە هەموویان کۆمەڵە فێڵ‌و تەڵەیەک‌و کۆمەڵێ درۆی ئەو ڕێویە پیرەبوون، بۆیە هەوڵیدەداو دەیویست باوکی هەڕەشەی لێبکات‌و توڕەیی‌و توندو تیژی لەگەڵدا بەکار بهێنێت .

ڕۆژێک هات کە سیدهارتای بچوک ئەوەی لەخەیاڵیدا بوو دژی باوکی بیکات، بە بێ پەردەو شەرم هەمووی دەربڕی، ئەمەش لەو کاتەدا بوو کە باوکی داوای لێکردبوو بڕێک وشکەدار کۆبکاتەوە، بەڵام ئەو لەجێگەی خۆی نەجوڵاو لە کوخەکە نەهاتە دەرێ‌و لە شوێنی خۆی ڕاوەستا، پێیەکی دا بە زەویداو بەدەسبەتاڵیەوە ئەو هەستی نەفرەت‌و بەکەم سەیرکردنەی بەرامبەر باوکی هەیبوو بێ پەردە درکاندی .

مناڵەکە لەو کاتەدا هاواریدەکردوو کەف پەڕیبووە دەمی‌و وتی: بڕۆ خۆت وشکەدار بێنە، من خزمەتکاری تۆ نیم ، دەزانم لێم نادەیت‌و





هەرگیز زاتی ئەو کارەت نیە، بەڵام دەزانم‌و هەست بەوە دەکەم کە تۆ بە بەردەوامی بەڕەحم‌و میهرەبانیەوە وریاو ئاگادارت کردومەتەوەو چاودێریت کردووم، هەروەها نەرم‌و دەستەمۆمت کردووم، تۆ دەتەوێ منیش وەکو تۆم لێبێت، منیش ببمە پاکیزەکارو میهرەبان‌و حەکیم، بەڵام بۆ ئەوەی ئازاری تۆ بدەم هەوڵدەدەم دزو جەردەو قاتڵم لێدەربچێت‌و بڕۆمە دۆزەخ‌و وەکو تۆم لێنەیەت، من نەفرەتت لێدەکەم، ئەگەر دەیەها پلەش مەعشوقی دایکی من بوویی‌و لەگەڵیدا خەوتبی، نابیتە باوکی من.

مناڵەکەی سیدهارتا لەکاتێکدا توڕەو بێ نەوابوو، وردە وردە لافاوی قسە ڕەقەکانی بەرەو ڕووی باوکی هەڵڕشت‌و کوخەکەی بەجێ هێشت، شەو درەنگانێ گەڕایەوە، ڕۆژێکیتر لەبەیانی زووەوە دیارنەما، ئەو بوخچە بچوک‌و ڕەنگینەش لەگەڵ ئەودا ونبو کە بەرهەمی زەحمەتی ئەو دوو بەلەمەوانەبوو پارەو پولیان تێدا هەڵدەگرت، هەروەها بەلەمەکەش دیارنەمابوو، سیدهارتا لەلایەکی تری ڕووبارەکە بەلەمەکەی دۆزیەوەو زانی کە مناڵەکەی هەڵهاتووەو ڕۆشتووە.

سیدهارتا زۆر نیگەران‌و دڵتەنگ بوو بەو قسە ڕەق‌و زبرانەی دوێنێی کوڕەکەی، دەیوت: دەبێت چاودێری بکەم‌و بەدوایدا بچم، ئەو مناڵە ناتوانێت بەتەنها لە جەنگەڵەوە بڕوات.

ئەی ڤاسیوڤیدا، ئێمە دەبێت بەلەمێکیتر لە لقی درەختەکان دروستبکەین‌و لە ڕووبارەوە بڕۆین.

ڤاسیوڤیدا وتی: ئێمە لە لقی درەختەکان بەلەمێکیتر دروستدەکەین تاکو ئەو بەلەمە بهێنینەوە کە مناڵەکە بردویەتی، بەڵام ئەی دۆستی

من، وازبێنە بابڕوات، ئەو چیتر مناڵ نیەو دەزانێت چۆن خۆی بپارێزێت، ئەو ڕێگای شاری گرتۆتەبەر، ئەو ڕاستدەکاتو حەق لای ئەوە، ئەوەت لە یادنەچێت  کە ئەو کارێکی ئەنجامداوە بەڵام تۆ لە ئەنجامدانی ئەو کارەیدا، ئەو هەموو سستیو تەمەڵەیەت نواند، ئەمەیە دەڵێم ئەو ئاگای لە خۆیەتیو بەڕێگای خۆیدا دەڕوات، ئەی سیدهارتا دەتبینم مەینەتباریو لە ئازارێکدا ماندویتو زەحمەتدەکێشی، بەڵام لە ڕاستیدا پێویستە بەو دۆخە پێبکەنی، کە زۆر دڵنیام  زۆر بە زوویی بەوە پێدەکەنیت .

سیدهارتا وەڵامی نەدایەوە، تەورێکی گرت بەدەستیەوەو کەوتە لەتکردنی قەدی قامیشەکانو ڤاسیوڤیدا لە بەستنی خێزرەو قامیشەکان کۆمەکی کردوو هەردوکیان سواری بەلەمە خێزەرانیە تازەکە بوونو بە زەحمەتێکەوە پەڕینەوە بۆ ئەو بەری ڕووبارەکە.

سیدهارتا پرسی: بۆچی ئەو تەورەت لەگەڵ خۆتدا هێنا؟

ڤاسیوڤیدا وەڵامی دایەوە: پێدەچێت  سەوڵی بەلەمەکەمان ونبوبێت، بەڵام سیدهارتا دەیزانی ئەو پیرە مێردە لە چ خەیاڵێکدایە، لەوانەیە مناڵەکە بۆ ئەوەی ڕێگری لەوە بکات کە بیدۆزنەوەو بەدوایدا بچن، سەوڵەکانی فڕێدا بێتە سوچێکەوە یان شکاندبێتنی، لە ڕاستیشدا هەر وابوو، بەلەمەکە هیچ سەوڵێکی تیا نەمابوو، ڤاسیوڤیدا بەزەردەخەنەیەکەوە لەنگەری بەلەمەکەی گرتو وەک ئەوەی بیەوێت بڵێت، ئەی نابینی کوڕەکەت چیدەڵێت، ئەی نابینی ئەو نایەوێت کەسێ دوایبکەوێت، بەڵام ئەو شتانەی نەدرکاندو خۆی خەریک کرد بە تاشینی سەوڵێکی ترەوە، سیدهارتا ئەوی بەجێ هێشتو ڕۆیشت بەدوای سۆراغی مناڵەکەیدا، ڤاسیوڤیداش ڕێگری نەکرد لە کارەکەیدا.





سیدهارتا ماوەیەکی زۆر لە دارستاندا مایەوە تاوەکو گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە گەڕان بەدوای کوڕەکەیدا بێ هودەیە، دەیزانی کە ئەو کوڕە چکۆلەیە دارستانی جێ هێشتوەو گەیشتوەتەوە شار، یان ئەوەتانێ هێشتا لەدارستاندا ماوەتەوەو دەیەوێت خۆی بشارێتەوە، بۆ ئەوەی ئەوانەی لە دووی دەگەڕێن نەیدۆزنەوە، چونکە زیاتر بیرکردەوەو زانی کە چیتر بابەتی ئەو لەئازارو مەینەتا نابن، هەروەها لە دەرونی خۆیدا هەستیدەکرد چیتر ئەو نەکەوتۆتە مەترسیەوەو توشی هیچ جۆرە شۆکێک نەبووە لەگەڵ ئەوەشدا، بەدوایدا دەگەڕا، بەڵام نەک بۆ ئەوی کوڕەکەی ڕزگار بکات، بەڵکو تەنها شەیدای ئەوە بوو جارێکیتر ببینێتەوە، بەم جۆرە تا دەوروبەری شار ڕۆیشت .

تاوەکو گەیشتە شەقامێکی گەورەی قەراغ شار، لە نزیک دەروازەی ئەو باغەی  کە ڕۆژانێک هی کەماڵە بوو، ئەو شوێنەی کە بۆ یەکەمین جار کەماڵەی لەسەر گالیسکەیەکەوە بینی بوو کە لەوێوە دەڕۆیشتەوە بۆ شار، سیدهارتا لەو جێگەیەدا وەستا، بیرەوەریەکانی ڕابردوو هەموویان بە بەرچاویدا تێپەڕین، جارێکی تر خۆی هاتەوەبەرچاو کە سامانایەکی لاوبوو،و بە ڕیشێکی درێژو تۆزاویەوە لەوێدا وەستاوە، سیدهارتا ماوەیەکی دوورودرێژ لەو شوێنەدا وەستا، لەو دەروازەوە لەناو باغەکەی ڕوانیو کۆمەڵە ڕەبەنێکی زۆری بینی کە لەژێر درەختەکاند سەرقاڵی هاتووچۆو پیاسەکردنن .

ماوەیەکی زۆر لەوێ وەستاو کەوتە بیرکردنەوەیەکی قوڵەوە وێنەکانی ژیانی پێشووی لەپێش چاویدا تێ پەڕین، ماوەیەکی زۆر وەستاو لە ڕەبەنەکانی ڕوانی، لە جێگەی ئەواندا سیدهارتاو کەماڵەی بینی، کە سەرگەمری پیاسەکردنن بەژێر درەختەکاندا، خۆی بینیەوە

که کەوتۆتە نەوازشی کەماڵەوەو یەکەمین ماچی لێوەکانی دەکات، چۆن ژیانی خۆی لەوپەڕی غرورەوە دەسپێکردبوو، هەموو شتەکانی بینی، کاماسڤاتی، خزمەتکارەکان، میوانەکانی، قوماربازەکان، یاری زانانی تەختە، مۆزیککارەکان، هەموویانیبینی، جارێکی تر چووە ئەو شوێنەو کەوتەوە ناو ئەو ژیانەی ڕابردوو، جارێکی تر کەوتەوە یاری "سانسارا" دووبارە پیرو ماندوو بوەوە، جارێکیتر هەستی بە نەفرەتی بەخۆدا چوونەوەکرد، جارێکیتر ئارەزووی مەرگی کردەوەو وشەی پیرۆزی "ئوم" بەرگوێی کەوتەوە.

پاش ئەوەی ماوەیەکی زۆر لە بەرامبەر باخەکەدا وەستا، گەیشتە ئەو دەرئەنجامەی ئەو مەیلەی کە ڕایکێشاوەتە ئەوێ زۆر گەمژانەبووە، چیتر ئەو ناتوانێت هاوکاری مناڵەکەی بکات، دەیزانی چیتر نابێت خۆی بە مناڵەکەیەوە ببەستێتەوە، ئەو لەپێناو هەڵهاتنی کوڕەکەیدا هەستی بە عەشقێکی بێپایان دەکرد، وەک برینێک لەسەر دڵی، بەڵام ئەو برینەی دڵی ئەوە نەبوو کە هەمیشە ئازاری بدات، بەڵکو ئەوەش هێدی هێدی ساڕێژ دەبێت.

بەڵام ئەو برینە خێرا لەو کاتەدا ساڕێژ نەبوو، هەستی بەئازارەکانی دەکرد، هەستی بەوەدەکرد لەجێگەی ئەو مەبەستەیدا کە ئەوی بەدوای مناڵەکەیدا پەلکێش کردوەتە ئەو شوێنەوە، شتێک بەجێ نەماوە، لەوپەڕی ئازارو نیگەرانیدا تێگەیشت کەشتێک لەناو دڵیدا مردووە، چیتر هەستی بە ئاسودەیی نەدەکردوو ئامانجێکی نەمابوو، بەئازارەوە دانیشتو دانی بەخۆداگرت، لە ڕووبارەوە فێر ببوو کە دابنیشێتو سەبری هەبێتو گوێ بگرێت، دانیشتو گوێی هەڵخست بۆ ئەو ڕێگا خۆڵاویو ئەو دڵەی کە لەو پەڕی ئازارو نیگەرانیەوە





لێیدەدات، لە چاوەڕوانی بیستنی دەنگێکدا بوو، چەند سەعاتێک لەوێ دانیشت، وایدانابوو کە لە بۆشاییو نەبووندا نوقم ببێت،تاکو هیچ شتێک چیتر لەپێش چاویدا گوزەرنەکات، داینابو نوقم بێتو پاشان ڕێگایەک بدۆزێتەوە، چونکە زانی چیتر ئەو برینە بەرەو ساڕێژ بوون دەچێت، وشەی پیرۆزی "ئوم" ی خستە سەر زمانیو ڕۆحی خۆی لێواولێوکرد لە وشەی "ئۆم" ڕەبەنەکانی باخ بینیان چەند سەعاتێکی دوورودرێژە لەوێ دانیشتوەو تەپوتۆز سەرو چاوی داپۆشیوە، یەکێک لەوانە هاتە لای سیدهارتاو مۆزێکی لە پەنادا دانا، بەڵام سیدهارتای پیر ئەوی نەبینی،

دەستی خستە سەر شانی سیدهارتاو لەو جیهانە هێنایە دەرەوە، سیدهارتا ئەو دەستە نازەنینو میهرەبانەی ناسیەوە، هەستاو بانگی ڤاسیوڤیدای کرد، کە بەدوای ئەودا دەگەڕا، ڕووخسارە میهرەبانەکەی ڤاسیوڤیدا بینیو ئەو خەندە بچوکەی ناسیەوە کە ڕوخساری چین چین کردبوو، سەیری چاوەڕۆشنەکانی کردوو ڤاسیوڤیدا زەردەخەنەیەک گرتی، مۆزەکانی دەرهێناو، یەکێکیانی دا بەو پیرە بەلەمەوانەو ئەوی تریان خۆی خواردی، پاشان ماوەیەک بە بێدەنگی بەدوای ڤاسیوڤیدادا، جارێکیتر ڕۆشتوەوە ناو دارستانو جارێکیتر سواری بەلەمەکە بوەوەو گەڕایەوە بۆ کوخەکەی.

هیچ یەکێک لەوانە چیتر ناوی مناڵەکەیان نەهێناو هیچ کامیان دەربارەی هەڵهاتنی مناڵەکەو برینەکانی دڵی سیدهارتا قسەیەکیان نەدرکاند، سیدهارتا ڕۆشتە سەر چرپاکەی ، پاش ماوەیەک ڤاسیوڤیدا بەجامێ شیری گوێزهێندیەوە چووە لایەوەو خەوێکی خۆش بردیەوە.

***

# ئۆم

ماوەیەکی دوورودرێژ برینەکەی دڵی بە ئازارەوە مایەوە، سیدهارتا بە بەلەمەکەی گەشتیاری زۆری لە ڕووبارەوە دەپەڕاندەوە، هەرجارێک کە گەشتیارێکی بەمناڵەوە دەبینی، ئیرەیی دەبرد بە دڵخۆشیان، بەڵام ئیرەیەکی دۆستانە، هەمیشە ئەوەی لە خەیاڵدا بوو کە: بۆچی خەڵکانێکی زۆر خاوەنی ئەو دڵخۆشییەن، بۆ نابێت منیش ئاسودەبم بەوجۆرە دڵخۆشیە؟ تەنانەت دزەکانو چەتەکانو خەڵکانی شەڕانگێزو بوغزاویش دەبنە خاوەنی مناڵو خۆشیاندەوێن، مناڵەکانیش سۆزوو خۆشەویستیان هەیە بۆ ئەوان، ئەوە بەتەنها منم کە بێبەشم لەو نیعمەتە.

سیدهارتا چیتر مناڵانە قسەیدەکردو بەڵگەی دەهێنایەوەو وەک خەڵکی سادەی لێهاتبوو، لەژێر ڕۆشناییەکی تردا خەڵکی دەبینی، چیتر بە غرورو زیرەکیەوە سەیری ئەوانەی دەکرد، لەو لایەنەوە ڕەفتاری گەرمترو وردبینتر ببوو.

لە ڕووباردا خەڵکی جۆراو جۆرو جیاوازی دەپەڕاندەوە، هەرلە سەربازو بازرگانو ژنو مێردەوە بۆ هەرچینو توێژێکیتر، بەڵام ئەوانە چیتر وەک ڕابردوو پێی نامۆ نەبوون، بەڵکو هەستی بەهەموویان دەکردوو لە دیدو بۆچوونو بیرکردنەوەیان بەشداریدەکرد، بەڵام بەشدار نەبوو لە ئارەزوو پێداویستیەکانی ژیانیان، گەرچی گەشتبوو بە دواهەمین پلەی کۆنترۆڵکردنی





کەسایەتی خۆی، لەگەڵ ئەوەشدا بەسەختی هەستی بەئازاری برینەکەی ناخی دەکردو باشیش بەرگەی دەگرت، هەروەها لەوە تێگەیشت کە ئەو هەموو خەڵکە سادانە دەبنە برای ئاینی ئەو.

چیتر بەچاوی سوک سەیری مەیلو ئارەزووە بچوکەکانو خۆفرۆشیەکانی نەدەکرد، پێیوا بوو ڕۆحیەتی ئەو خەڵکانە شایستەی تێگەیشتنەو جێگەی ڕێزو خۆشەویستین. سیدهارتا دەیبینی کە دایک عەشقێکی تەواوی بۆ مناڵەکەی هەیە، یاخود باوک شێتانە مناڵە تاقانەکەی خۆی خۆشدەوێت، هەروەها کچێکی جوان بۆ سەرنج ڕاکێشانو خۆشەویستیو دڵگیری پیاوان، بەخشڵو خۆڕازاندنەوە بەشتە جوانەکان، پەیوەندیەکی فراوان نیشاندەدات.

لەپێشچاوی سیدهارتادا ئەو سۆزە ڕوکەشو ساکارو مناڵانە، کەلە هەمان کاتیشدا بەهێزوو ژیاندۆستانەبوو، ئەو هەستو هەوەسو ئارەزووانە چیتر بچوکو کەمبەها نەبوون، بەڵکو دەیبینی کە چۆن خەڵک لەپێناو ئەو شتانەدا کۆشش دەکەنو هەوڵدەدەن، خەڵکی چۆن سەفەر دەکەن، دەجەنگێن، زەحمەت دەکێشن، عەشق دەکەنو ژیان دەگوزەرێنن، سیدهارتا لە تەواوی ئارەزوو پێداویستیەکانیاندا ژیانو نەمری براهماکانو ڕۆحو زیندویەتی دەبینی، ئەو خەڵکەی کە ئەو هەموو عەشقو ستایشو هێزوو شەیدابوونەیان هەبوە شایستەی خۆشویستن بوون.

بەدەر لەیەک شت، شتێکی زۆر بچوک، ئەمانە شتێکیان کەمتر نەبوو لە بیرمەندو حەکیمەکان، ئەو شتەش وشیاری بوو دەربارەی یەکڕەنگیو یەکیەتی جیهانو ژیان، هەندێک جار سیدهارتا، تەنانەت گومانی لەوەش دەکرد کە ئەوەی بەجۆرە چاکەکاریەکی خۆیوو

خەڵکی حەکیم دەزانیو هەروەها ئەوانەی وەک منالآنی بیرمەند وێنادەکرد، لەهەموو حاڵەتێکدا خەڵکی بە یەکسان لەگەڵ بیرمەندەکاندا دەبینیو تەنانەت لەزۆر لایەنەوە لەبیرمەندەکان بە گەورەتری دەزانین، دروست وەک گیانلەبەرەکانیتر، کاتێک کە بەتەواوی بەهێزو تواناوە پێداویستیەکانیان بەدەست دەهێنن، بەجۆرێک دێنە پێش چاوو کە لە مرۆڤ بالآترین.

لەناخی سیدهارتادا شتێک سەریهەڵداو گەشەیکرد، لەخۆی دەپرسی: باشە لە ڕاستیدا مەعریفە چیە؟ ئەو بەدوای چیدا گەڕاوە، ئەو شتە تازەیەش دەرکەوتنو ئامادەگی ڕۆحی سیدهارتاو توانای بوونی ئەو بوو، هەروەها ئاشنایەتیەکی پڕ لە بیرکردنەوەو هەستکردنو پەیبردنو تێگەیشتن بوو لە یەکیەتی بوونی شتەکان، ئەم تێفکرینە، یاخود وەستان لەسەر کەماڵی ئەبەدی جیهانو هاوئاهەنگیو یەکیەتی جیهان لە ناخیدا ڕەگی داکوتا، کاردانەوەی ئەم حاڵەتەش لە ڕوخساری منالآنەو بەسالآچووی ڤاسیوڤیدادا دەبینرا.

بەڵام هێشتا برینەکەی دڵی سیدهارتا ئازاری هەبوو، لەوپەڕی مەینەتو ئازارا بە عەشقێکی پڕەوە بیری منالەکەی دەکرد، زیاد لە پێشتر خۆشەویستی ئەوی لە دڵدا پەروەردە دەکردو دڵی خۆی تەواو پڕکردبوو لە سۆزو خۆشی ئەو، بێ باک لەوەی ئازارو مەینەت ئەشکەنجەی بدات، بۆئەوەی لەهەموو ئازارو مەینەتیەکاندا بژیو زەحمەت بکێشێ، ئەو شەوقەش هیچکات خۆبەخۆ خامۆش نەدەبوو.

ڕۆژێک ئازاری برینەکەی دڵی سیدهارتا زۆر زیادی کردبوو، بۆیە لە کەنارێکەوە بەلەمەکەی بردە ناو ڕووبارەکەوەو بڕیاریدا بەدوای منالەکەیدا بچێت بۆ شار، جوڵەی ڕوبار هێمنو ئارام بوو، گەرچی





لەو کاتەدا وەرزی وشکی دەستی پێکردبوو بەڵام ئاوازی ڕووبار زۆر ڕوونو ئاشکرا بەرگوێ دەکەوت، ڕووبار، قا..قا ... پێدەکەنی، لە کەماڵی شادیو ڕۆشنایدا پێدەکەنی، لەوە دەچوو ڕووبار بەو بەلەمەوانە پیرە پێبکەنێت.

سیدهارتا بە بێدەنگی وەستا، بۆ ئەوەی جوانتر گوێ لە ئاوازی پێکەنینی ڕووبارەکە بگرێت، چین چین بەسەر ئاوەکەدا تێکەڵ بوو، لەو ڕووبارە هێمنو ئارامەدا ڕوخساری خۆیی بینیەوە، کاتێ لەئاوەکەدا وێنەی خۆی بینی شتێکی بیر کەوتەوە، شتێک عەیامێک بوو فەرامۆشی کردبوو، ئەوەش خستیە تێرامانو بیرکردنەوەیەکی قوڵەوە، ئەو شتەی هاتەوەیاد کە ڕوخساری لە ڕوخساری کەسێک دەچوو، ئەو کەسەی کە ڕۆژگارێک دەیناسیو خۆشیدەویست، تەنانەت ترسی ئەوی لەدڵدابوو، ئەو سیماو ڕوخسارەش، هاوشێوەی ڕووخساری باوکە براهماکەی بوو، سیمای سیدهارتا شێوەی ئەوی گرتبوو، ئەوەی بیرکەوتەوە کە ڕۆژگارێک چۆن باوکی ناچار کرد بواری بداتو بهێڵێت بچێتە ڕیزی زاهیدەکانەوە، چۆن مۆڵەتی لێوەرگرتو بە جێیهێشتو چیتر نەگەڕایەوە.

مەگەر باوکیشی بەوجۆرە لە ئازارو مەینەتدا نەبوو؟ ئەی باوکیشی وەک ئەو، بۆ ڕۆشتنی منداڵەکەی ئازاری نەچەشتبوو؟ کەواتە بۆ نابێت سیدهارتاش چاوەڕوانی خۆی بە چارەنوسێکی وەها بزانێت؟ ئەی کەواتە ئەو سوڕانەوەو دووبارەبوونەوەی ڕووداوانە کە لەبازنەی ڕێزوحورمەتا دەخولێنەوە، شتێکی گاڵتەجاڕوو کاڵفامانە نیە؟

ڕووبار پێدەکەنی.. بەڵێ ، ئەمە حەقیقەتی ئەو ڕووداوانە بوو، هەر

شتێک تاکۆتایی زەحمەتی لەگەڵدا نەکێشیو سەرئەنجام نەگاتە کۆتایی، جارێکیتر دەگەڕێتەوەو دەبێت ئەو هەموو زەحمەتو ماندووبوونە لەخۆیدا هەڵگرێت.

سیدهارتا لەناو بەلەمەکە دانیشتو پاشان گەڕایەوە بۆ کوخەکە، بیری باوکی دەکردوو بیری لە منالەکەشی دەکردەوەو ڕووباریش بەو پێدەکەنی، سیدهارتا لەجەنگدابوو لەگەڵ خۆیداو لە گۆشەی نائومێدیدا بوو، مەیلێکی سەیری لەخۆیدا دەبینی  کە بەدەنگی بەرز بەهەموو جیهان پێدەکەنێ، هێشتا برینەکەی دڵی پڕ ئازار بوو، هێشتا دەیویست لە چارەنوس هەڵبێت، هێشتا ئارامیو سەرکەوتن لە زەحمەتو ماندووبونەکەیدا بەدینەدەکرا، بەڵام گەشبینتر ببوو، دووبارە گەڕایەوە کوخەکەو لەدڵی خۆیدا هەستێکی قوڵی لادرووستبو، کە چیتر لەلای ڤاسیوڤیدا دان بەهەموو شتەکاندا بنێتو بێ پەردە هەموو شتێک بۆ ئەو پیاوە بدرکێنێ، ئەو پیاوەی کە شارەزابوو لەهونەری گوێگرتن.

ڤاسیوڤیدا لە کوخەکە دانیشتبوو خەریکی چنینی سەبەتە بوو، چیتر ئیشی بەلەمەوانی نەدەکرد، دەستو بازوو،و چاوەکانی تەواو کزو لاواز ببوون، بەڵام تاقە شتێک کە لەو پیاوەدا نەگۆڕابوو، ئەو شادیو خۆشبەختیو ئارامیە بوو کە لە ڕوخساریدا دەبینرا.

سیدهارتا لەتەنیشت ئەو پیرە پیاوە بەساڵاچووەدا دانیشتو بەهێمنی دەستیکرد بە قسەکردن، ئەوەی کەپێشتر بەوی نەوتبوو، هەمووی بۆ باسکرد، واتە پێیوت کە چۆن دەیویست بگەڕێتەوە بۆ شار، دەربارەی ئازاری برینەکەی دڵی، دەربارەی ئەو ئیرەییو خۆزگەیەی کە لەخۆیدا هەستی پێدەکرد لەکاتی بینینی باوکە





خۆشبەختەکاندا، دەربارەی زانینی ئەو جۆرە هەستکردنە کاڵفامانەی خۆیوو ئەو جەنگو کۆششەی کە هەیەتی لەگەڵ خۆیدا، دەربارەی زۆر شت قسەی کرد لەگەڵ ڤاسیوڤیدادا، ئەوەی کەلە دڵیدا بوو خستیەسەر زمانی، هەمووی بۆ شیکردەوەو تەنانەت ئازاراویترین مەرامیشی بۆ باسکرد، برینەکەی دڵی نیشانداو لە هەموو شتێک ئاگاداری کردەوە، لە هەڵاتنی ئەو ڕۆژەش کە چۆن دەیویست بەدوای منداڵەکەیدا لە کۆڵانو شەقامەکانی شاردا سەرگەردان بێتو لەوەی کە چۆن ڕوبار پێی پێکەنیبوو، هەمووی بە دۆستەکەی وت.

سیدهارتا بەو جۆرە قسەکانی خۆی بۆ ڤاسیوڤیدا کردوو ئەویش بە ڕوخسارێکی ئارامەوە گوێی لێ گرت.

سیدهارتا زیاد لە هەموو کاتێکی تر سەری سوڕمابوو لەو دیقەتە سەیرەی ڤاسیوڤیدا، هەستی بەو زەحمەتو ئارەزووو ئومێدە پەنهانەکرد، کە ڕووی تێدەکردو پاشان لێی دوور دەکەتەوە، پیشاندانی برینەکەی دڵی سیدهارتا بۆ ئەو گوێگرە، وەک داشۆرینی برینەکەی بوو لەئاوی ڕووباردا، دواجار کە سارێژ بوو تێکەڵ بە ڕووبار دەبوو، هەردووکیان دەبوونەوە بەیەک، هەستی بەوەکرد کە چۆن بەو جۆرە قسەی دەکردو ڕاستیەکانی دەدرکاند، ئەوە چیتر ڤاسیوڤیدا نیە، ڤاسیوڤیدا چیتر ئەو پیاوە نەبوو کە گوێی بۆ سیدهارتا دەگرت، سیدهارتا کە بینی چیتر ئەو گوێگرە بێدەنگو بێ جوڵە وەک درەختێک چۆن دڵۆپە بارانەکان بۆ خۆی ڕابکێشێت، بەهەمان شێوە دانپیانانو ڕاستیەکانی ئەو قەبوڵ دەکات .

سیدهارتا هەستی بەوەکرد، کە ئەو پیاوە دامرکاوە چیتر خۆی ڕووبارە، خۆی خودایەو خۆی ئەبەدیەتە، سیدهارتا گفتوگۆکەی خۆی

تەواوبوو، كۆتایی بە ڕازو نهێنی غەمی دڵی خۆی هێنا، تێگەیشتن لە گۆڕانی ئەو بارودۆخەی ڤاسیوڤیدا، سیدهارتای خستە بیركردنەوەیەكی قوڵەوەو هەرچی زیاتر لەو بارەیەوە بیری كردەوە، ئەو گۆڕانە سادەتر خۆی نواندو هەرچی زیاتر پەی پێبردو لەوە تێگەیشت كەهەموو شتێك سروشتیو ڕێكخراو دامەزراوبووە.

ڕوانی كە ڤاسیوڤیدا لەسەردەمانێكی زۆر پێشوترو بەردەوام لەو بارودۆخەدا بووە، بەكورتی سیدهارتا بەو نهێنیەی نەزانیوە، بەڵام دەیبینی كە خۆیشی لەگەڵ ئەودا ئەوەندە جیاوازی نیە، بەڕاستی هەستی بەوەدەكرد كە خەڵك چۆن سەیری خوداكان دەكەن، ئەویش هەروا سەیری ڤاسیوڤیدای كردوە، زانی كە ئەم حاڵەتە بەردەوامی نابێت، بەڵام لەناوەوە خۆی ڕزگاركرد لەفكری ڤاسیوڤیداو لە هەمانكاتیشدا قسەی بۆدەكرد.

كاتێك قسەكردن كۆتایی هات، ڤاسیوڤیدا بە چاوەكزو نیگا لاوازەكەیەوە سەرنجی سیدهارتای دەداو وشەیەكی نەدركاند، بەڵام لە ڕووخساری سیدهارتادا نوری خۆشەویستی، ئاسودەیی، تێگەیشتنو حیكمەت دەركەوتبوو، دەستی سیدهارتای گرتو بردی بۆ كەنار ڕووبارەكەو لە تەنیشتیەوە دانیشتو وتی:" تۆ پێكەنینی ئەم ڕووبارەت بیست، بەڵام هێشتا هەموو مەبەستەكانت نەبیستوە، با دووبارە گوێ بگرین تاوەكو زیاتر ببیستی "

هەردوكیان پێكەوە گوێیان ڕادێرا، دەنگی هەزاران ئاوازی ڕووبارە بەهێمنی شەپۆلیدەدا. سیدهارتا تەماشای ئاوەكەی دەكردو وێنەی جیاوازی لەو ئاوە سازگارەدا دەبینی، وێنەی باوكی خۆی بینیەوە كەچۆن بەتەنیا دانیشتوەو ماتەمبارە بۆ كوڕەكەی، هەروەها وێنەی





خۆیی بینیەوە چۆن گرفتارو شەیدای خۆشەویستی مناڵێكە كەلێی دوور كەوتوەتەوە، كوڕەكەی خۆی بینیەوە كە بەتەنیاو بەتاسەوە ڕێگای ئاگرینی هەواو هەوەسەكانی ژیان دەپێوێتو هەموو هەوەسو ئارەزوویەك بوەتە ئامانجی ژیانو هەر یەكێك لەوانەش بووەتە بەربەستێك لە بەردەم گەیشتن بە ئامانجەكانیو هەریەكەیان هەڵگری میحنەتێكە.

دەنگی ڕووبار غەمگین بوو، ڕووبار بە غەمو نیگەرانیەوە گۆرانی دەوتو لە جوڵەیەكی بەردەوامدا بوو بەرەوئامانج، نیگا لاوازو پرسیارئامێزەكانی ڤاسیوڤیدا لە ڕووخساری سیدهارتا ڕامابوون، ڤاسیوڤیدا پرسی " ئایا دەبیستی ؟" سیدهارتا سەرێكی ڕاوەشاند،

ڤاسیوڤیدا بەهێمنی وتی" باشتر گوێ بگرە"

سیدهارتا هەوڵیدا باشتر گوێ بگرێت، وێنەی باوكیو وێنەی خۆیو وێنەی مناڵەكەی هەمووی تێكەڵ ببوونو بەئارامی بەلایدا تێپەڕین، وێنەی كەماڵە دەركەوتەوەو پاشان ئەویش تێپەڕی، وێنەی گوڤینداو ئەوانیتر دەركەوتو پاشان هەموویان تێپەڕین، هەموویان بوون بە بەشێك لە ڕووبار، ئارەزوو، ڕەنج، غەم، مەینەتو هەوەسەكان، ئەمانە ئامانجی هەموو ئەوانەبوو، بۆیە دەنگی ڕووبار پڕ ببوو لەهەوەسو لەخۆشەویستی، پڕ ببوو لە ئارەزووە تێرنەبوەكان، ڕووباریش بەرەو ئامانجی خۆی دەجوڵا، سیدهارتا ئەماشایدەكرد كەچۆن ڕوبار تێكەڵ دەبێت بەدەنگی خزمو ئاشنایانو بەهەموو ئەو خەڵكانەی كە ڤژی بینیونو دەیانناسێتو بەخێرایی تێدەپەڕێت، شەپۆلەكانی ڕوبار بەخێرایی بەیەكدا دەهاتن، هەموویان لە مەینەتو ئازارو زەحمەتا بوون بەرەو ئامانج، بەرەو تاڤگەكانو

دەریاکانو لافاوو ئۆقیانوسەکان لە جوڵەدا بوون، هەریەکەیان بە مەرامی خۆی دەگەیشت، هەر شەپۆلەو دەکەوتە داوی شەپۆلێکی دیکەوە، ئاو دەبوو بە هەڵمو دەنیشتە ئاسمان، دەبوو بە بارانو دەباری، لە شێوەی کانیو جۆگەلەو ڕووباردا دەردەکەوتەوە، گۆڕانکاری ڕیتمێکی وەرگرتو بەردەوام جمەی دەهات.

چیتر ئەو دەنگە ئارەزوومەندانە گۆڕانی بەسەردا هاتبوو، بەڵام هێشتا سەدان وهەزاران دەنگ، دەنگی میهرەبانی، دەنگی خەندەو پێکەنین، دەنگی چاکەو خراپە، غەمو شادی هەموویان لەگەڵ دەنگی غەمگینی ڕووباردا ئاوێزانی یەکتربووبوون.

سیدهارتا گوێ قوڵاخ بوو، زۆربەی ئەو دەنگانەی بیتسبوو، ئاوازەکانی ڕووبار بەرگوێی کەوتبون، بەڵام چیتر ئەمرۆ ئەو دەنگانەو ئەو ئاوازانە، بەجۆرێکیترو ئیقاعێکیتر بەرگوێی دەکەوتن، ئەمرۆ نەیدەتوانی جیاوازییکات لەنێوان دەنگە جوداکاندا، دەنگی پێکەنینی لە دەنگی گریانو دەنگی منداڵی لەدەنگی هەرزەکار جیانەدەکردەوە، گریەوزاریو ئارەزوومەندی خەندەی حەکیمەکان، هاواری خەوزڕانو مەرگ، هەموویان بەسرابوون بە یەکەوە، بەهەزاران ڕێگاو هەزاران شێوە وەک تۆڕێک بەیەکاچووبوون .

ڤاسیوڤیدا بەو شێوەیە کەوتەڕێ، سیدهارتا بەویقارو شادمانیەکەوە تەماشای کردو سەرنجیدا، سەیری هەنگاوە پڕخۆشنودەکانیو ڕوخساری درەوشاوەو پەیکەرە نورانیەکەی ڤاسیوڤیدای کردو وردەوردە بەئارامی دووردەکەوتەوە.

***





# گۆڤیندا

گۆڤیندا، بەهێمنی ماوەیەکی زۆری لەوباغەدا بردەسەر کە کەماڵەی سۆزانی پێشکەشی کردبوو بە موریدەکانی گوَتاما، پاشان لەکەناری ڕووباردا ماوەی ڕۆژێک مایەوەو کۆمەڵێ شتی لەو بەلەمەوانەوە بەرگوێ کەوت کە پیاوێکی حەکیمو داوێن پاک بوو، مەبەستی بوو لەوسەفەرەیدا چیتر نزیک ڕووبارو بەلەمەوانەکە هەڵبژێرێت بۆ مانەوەی چوونکە شەیدای سەردانو بینینی بەلەمەوانەکەبوو، گەرچی سەرتاسەری ژیانی، بەپێی ڕێنمایەکانی بوودا ڕەفتاری کردبوو بەڵام لەبەر ئەوەی چووبوە ساڵەوەو لەخۆبردوو بوو، هەموو ڕەبەنە لاوەکان ڕێزیان لێدەگرتو جێگەی سەرنجی هەمووان بوو، بەڵام هێشتا لەدڵەوەهەستی بە نائارامی دەکردو دەیبینی هەمو شوێن کەوتنو گەڕانێکی بێ سودبووە.

گەشتە سەر ڕووبارو داوای لە بەلەمەوانە پیرەکە کرد کە بیپەڕێنێتەوە بۆ ئەوبەری ڕوبار، کاتێک لەوبەرەوە لە بەلەمەکە دابەزی وتی " تۆ بەرامبەر ڕەبەنەکانو گەشتیارەکان میهرەبانیتو خەڵکانێکی زۆری وەک ئێمەت پەڕاندوەتەوە، ئایا تۆش شوێنکەوتووی ڕێگای حەقیقەتی؟

لە چاوە پیرەکانی سیدهارتادا زەردەخەنەیەک دەرکەوتو وتی" ئەی پیاوە بەڕێزەکە، ئەی ئەو کەسەی ساڵانێکی دووروودرێژە عابای

موریدەکانی گۆتامات پۆشیوە، ئایا تۆش خۆت بە باسکارو عەودالّی حەقیقەت دەزانی؟"

گۆڤیندا وتی " دەبینی کەمن جگە لە پیرە مێردێک شتێکی زیاترنیم، بەلاّم هیچ کاتێک لە ژیاندا کۆلّم نەداوە لەهەولّو کۆششو گەڕان بەدوای حەقیقەتداو هەرگیز نەوەستاومو هیچ کاتێکیش ناوەستمو کۆلّنادەم، پێم وایە ئەوە بێت چارەنوسی من، دەشێ تۆش زۆر گەڕابیو عەودالّی حەقیقەت بی، ئەی دۆستی من، دەتوانی لە گەڕانو بەسەرهاتەکانی خۆت کەمێکم بۆ بگێڕیتەوە؟"

سیدهارتا وتی "چ شتێک هەیە بیلّێم کە بەهایەکی هەبێت، جگە لەوەی بلّێم پێدەچێت تۆ لەو زۆر گەڕانە خەستەدا شتێک بەدەست نەهێنی"

گوڤیندا پرسی " چی دەلّێیت ؟"

سیدهارتا وتی" زۆر جار ئەوە ڕودەدات، کە کەسێک خوازیارو عەودالّی شتێکە، بەلاّم جگە لەو شتەی کە مەبەستیەتی هیچی تر نابینێت، ئەو کەسە ئیتر توانای پەیداکردنو بەدەستهێنانی شتێکی تری نابێت، چونکە وابەستەیە بەو شتەوە کە لەخەیالّیدایەو بیری لێدەکاتەوەو تەنها بەدوای ئەو شتەدا دەگەڕێ، چونکە ئەوکەسە مەبەستێکی هەیەو ئەو مەبەستو نیەتەش بیری ئەوی سەرقالّ کردوە بەخۆیەوە، گەڕیدەن بەو واتایە دێت کەمرۆڤ مەبەستێکی هەبێت، بەلاّم تێگەیشتن لە واتای ئەو مەبەستە، ئازادبوونو نەبونی ئامانجێکی دیاریکراوو پێشوازیکردنە، ئەی دۆستی ئازیز، تۆ لەوانەیە گەڕیدەیەک بی کاتێ لەپێناو ئامانجو موڕادی خۆتا دەگەڕێی زۆربەی ئەو شتانە نەبینی کە لە تەنیشتەوەن".





گۆڤیندا وتی "باش لە قسەکانت تێناگەم، دەتەوێ بلّێی چی؟"

سیدهارتا وتی" ئەی پیاوی گرانبەها، سالآنێکی زۆر لەمەوبەر تۆ هاتیت بۆ ئەم ڕووبارەو پیاوێکت بینی خەوتبوو، تۆ لە تەنیشتیەوە دانیشتیو پاسەوانیت کرد لەکاتی خەوتنیدا، بەلاّم تۆ.. ئەی گوڤیندا ئەو پیاوە خەوتوەت نەناسیەوە ؟!"

ئەو کاهینە سەرسوڕمانێکی سەیرو سەمەرە دایگرتو لە سیدهارتا ڕاماو دواجار بەدەنگێکی لەرزۆکەوە پرسی " ئایا تۆ سیدهارتای ؟ ئەمجارەش نەمناسیتەوە، زۆر خۆشحالّم بە بینینەوەت، زۆر زۆر خۆشحالّم، ئەی دۆستی من، تۆ زۆر گۆڕاوی، تۆ بووی بە بەلەمەوان؟"

سیدهارتا بەگەرمی پێکەنیو وتی" بەلّێ من بوومەتە بەلەمەوان، چەند زۆرن ئەو خەلّکانەی کەدەبێت زوو بگۆڕێنو جلی جۆراو جۆر لەبەربکەن منیش دەبمە یەکێک لەوانە، ئەی دۆستی من، دەخوازمو میوانداریت بکەم کە ئەمشەو لە کوخەکەی مندا بمێنیتەوەو شەو بگوزەرێنی"

گۆڤیندا شەوی لە کوخەکەی ئەودا بردەسەرو لەسەر ئەوچرپایە خەوت کەڕۆژگارێک شوێنی خەوتنی ڤاسیوڤیدا بوو، پرسیارگەلێکی زۆری لە دۆستەکەی سەردەمی لاویەتی خۆی کرد، سیدهارتاش باسو خواستی زۆری هەبوو بۆی بگێڕێتەوە.

کاتی بەیانی وادەی ڕۆشتنی گۆڤیندا بوو، کەمێک بە ڕاڕاییەوە بە سیدهارتای وت" ئەی سیدهارتا، بەر لەوەی بەڕێگای خۆمدا بڕۆم دەمەوێ پرسیارێکی ترت لێ بکەم، ئایا تۆ لە ناخی خۆتدا هیچ بیروباوڕو بنەمایەکت هەیە بۆئەوەی لە ژیانداو لە ئەنجامدانی

کردەوەی چاکدا کۆمەکت بکات؟"

سیدهارتا وتی "دۆستی من، دەزانی کاتێک کە لاوبووینو لە جەنگەڵدا دەژیاین، من ڕووم وەردەگێڕا لە مامۆستاکانو بیروباوەڕەکانو هیچ متمانەیەکم پێیان نەبوو، من هێشتا هەر ئەو کەسەمو بیرکردنەوەی خۆمم نەگۆڕیوە، من لەو کاتەوە تا ئێستا، مامۆستای زۆرم هەبووە، ماوەیەکی زۆر سۆزانیەکی جوان مامۆستای من بوو، کەسێکی بازرگانو کەسێکی تری قومارباز بوونە مامۆستای من، سەردەمێکیش یەکێک لە ڕەبەنە گەڕۆکەکانی بوودا مامۆستای من بوو، بەڵام ئەو لە ڕێگای زیارەتکردنێکدا وەستا، تا جارێکیان کاتێ خەوتبوم پاسەوانی کردم، من لەویشەوە شتێک فێربوومو لەو لایەنەشەوە زۆر زۆر سوپاسی دەکەم، بەڵام زیاتر لە هەموو شتێک من لەم ڕووبارەوەو لە کەسێکەوە کە پێش من ئەم بەلەمەی لێدەخوڕی، هەموو شتێکو مەبەستێک فێربووم، ئەو بەلەمەوانە پیاوێکی سادەبوو، هێزی بیرکردنەوەی نەبوو، بەڵام بەهەمان شێوەی گۆتاماو بە باشی بنەماو یاساکانی ژیانی دەزانیو لێیان تێدەگەیشت، ئەو پیاوێکی پیرۆزو ئەولیابوو".

گۆڤیندا وتی" ئەی سیدهارتا... پێم وایە تۆ هێشتا گاڵتەو گەپت خۆشدەوێ، من باوەڕ بە تۆ دەکەم کە پەیڕەوی هیچ مامۆستایەکت نەکردووە، بەڵام ئایا خۆت هیچ جۆرە باوەڕێک یان بیرکردنەوەیەکی تایبەتت نیە؟"

ئایا شتێکی تایبەتت نیە کە لە ژیاندا کۆمەکی تۆی کردبێ ؟ من زۆر خۆشحاڵو سوپاس گوزار دەبم ئەگەر لەو بارەوە شتێکم بۆ بگێڕیتەوە"





سیدهارتا وتی "بەڵێ ، بیرو بۆچونو مەعریفەیەکی باشم بەدەستهێناوە لەم گۆشەو کەنارانەدا، سەعاتێک ئامادەبووم لە بەردەم حیکمەتەکاندا، بەو جۆرەی کە مرۆڤ لە دڵی خۆیدا بە ئاگادێتەوە، بەرامبەر بە ژیان خۆی بیروبۆچونێکی زۆرم ئەزمونکرد، بەڵام گرفتەێکی گەورەیە ئەگەر ئەوانەت بۆ باسبکەم، بەڵام ئەی گۆڤیندا... شتێک هەیە زیاد لە هەموو شتەکانیتر منی خستە ژێر کاریگەری خۆیەوە، ئەی دۆستی من... حیکمەت شتێک نیە کەسێک بیدات بە کەسێکیتر، ئەو حیکمەتەی کە حەکیمێک هەوڵدەدات پێشکەشی ئەوانیتری بکات هەمیشە کارێکی بێ ماناو گەمژانەیە"

گۆڤیندا وتی" تۆ گاڵتەدەکەی ؟"

سیدهارتا وتی" نەخێر، ئەوەی کە خۆم دۆزیومەتەوەو بەدەستمهێناوە بۆتی باسدەکەم، زیانیاریو مەعریفە دەربارەی شتێک، دەشێ بگوازرێتەوە بۆ کەسێکیتر، بەڵام حیکمەتی ئەو شتە هەرگیز نمایش ناکرێتو نادرێت بەکەس، دەکرێ لەوانە تێبگەیتو هێزو توانایان لێوەرگریتو کاری سەر سوڕهێنەر ئەنجام بدەی، بەڵام هەرگیز ناکرێ ئەو حیکمەتانە پێشکەش بکەیت بە کەسێکیترو فێری بکەیت، کاتێک لاو بووم لەم نهێنیە بە ئاگاهاتمەوە و پشتمکردە هەموو مامۆستاکانو ڕووم وەرگێڕا لەوانەکانیان، تەنها یەک بیر کردنەوەم هەبوو، ئەی گۆڤیندا.. پێموایە تۆ دووبارە وا دەزانی گاڵتەت لەگەڵدا دەکەم، بەڵام بزانە کە ئەمە بیروبۆچونی منە، لەبەرامبەر حەقیقەتەکاندا، دژەکانیش ئامادەگیان هەیەو ئەو دژە حەقیقەتانەش خۆیان جۆرێکن لە حەقیقەت، بۆ نمونە حەقیقەتێک ئەگەر یەکلایەنە بێت، دەتوانین لەناو وشەکاندا جێگەی بکەینەوەو قسەو باسی

لەبارەوە بکەین، هەر شتێک کەوتە ناو چوارچێوەی وشەکانەوە یەکلایەنەیەو بەمپێیەش نیوە حەقیقەتێکەو لەکەماڵی یەکیەتی شتەکاندا سودو بەهرەیەکی نیە، کاتێک بوودای مەزن بیری لە جیهانی گەورە دەکردەوە کورتەی ئەو بیرکردنەوەیەی لە دوو شتا جێدەکردەوە، واتە" نێرڤانا" و " سانسارا" یان حەقیقەتو وەهم، یاخود ڕزگاریو زەحمەت، نەدەبوو کارێکیتر بکات، بۆ ئەوانەی کە وانەکان دەڵێنەوە ڕێچکەیەکی تر لە ئارادایە، بەڵام خۆی ئەو جیهانەی کە لەدەورووپشتی ئێمەدا بوونی هەیەو لەناوماندا ئامادەیە یەکلایەنە نیە، هیچکاتێک یەک مرۆڤ یان یەک کرداری مرۆیی بە تەواوی سەر بە نێرڤانا یان سانسارا نیە، هیچ کاتێک مرۆڤێک نیە سەراپا هەمووی پیرۆزبێت، یاخود سەراپا گوناهبار بێت، ئەمەش بەو جۆرەیە کە ئێمە لەو وێناکردنە وەهمیەدا ڕەنجو زەحمەت دەکێشین کە پێیوایە" کات شتێکی واقعیو ڕاستەقینەیە" ئەی گۆڤیندا، کات شتێکی ڕاستەقینەیە، من وەک یاری تۆپەکان لەمانە گەشتووم، بەڵام ئەگەر کات شتێکی واقعیو ڕاستەقینە نەبێت، ئەوا ئەو کاتە ئەوهێڵەی کە لەنێوان جیهانو ئەبەدیەتدا، لەنێوان ڕەنجو خۆشبەختیدا، لەنێوان چاکەوخراپەدا هەیە، خۆیشی جگە لەوەهمێک هیچی ترنیە.

گۆڤیندا بەسەر سوڕمانەوە پرسی" چۆن دەبێت ؟!"

سیدهارتا وەڵامی دایەوە " گوێ بگرە ئەی دۆستی من، من گوناهکارم، تۆش گوناهکاری، بەڵام ڕۆژێک ئەم گوناهکاریە دەگەڕێتەوەو دەبێتەوە بە براهما، ڕۆژێک دەگات بەنێرڤانا، ڕۆژێک دەبێتە بوودا، ئەمە ئەو (ڕۆژە)یە کە ئێمە پێی دەڵێین تەنها وەهمێکەو هیچیتر، گوناهکار بە ڕێگایەکدا ناڕوات وەک ئەو ڕێگایەی بودا، ئەو





سەرقاڵی کامڵبوون نابێت، بیروو بۆچوونی ئێمە ناتوانێت شتەکان بە شێوەیەکی تر ببینێت، ئەو بودا بەتواناو بێ هاوتایە لە دەرونی گوناهکارێکیشدا هەیەو هەمان ئەو ئایندەیەش هەیە، دەکرێ ئەو بودا بێ هاوتایە لەناو منو تۆداو لەناو هەر کەسێکی تردا هەبێتو بناسرێت، ئەی گۆڤیندا، جیهان شتێکی ناکامڵ نیە کە بەهێمنی بەڕێوەبێت بەرەو کامڵبوون، نەخێر، جیهان لەهەموو چرکە ساتێکدا کامڵە، هەموو گوناهکارێک لەناخی خۆیدا شادمانیو میهرەبانیەکی هەیە، هەموو منداڵەکان خەڵکانیکی پیریشن، هەموو شیرەخۆرەکانیش مەرگ لەناخیاندا ئامادەگی هەیە، هەموو مردووە بەسەرچوەکانیش بەشدارن لە ژیانی جاویدانیدا، ئەوەی گرنگە بیزانین ئەوەیە کە ئەوێکیتر تاچ ئەندازەیەک لەم ڕێگایەدا پێشکەوتوەو لەژێر کاریگەریو توانای کەسێکیتردا نیە.

بودا لە قوماربازێکو چەتەیەکیشدا بوونی هەیە، ئەو چەتەیەش لەناو براهمایەکدا ئامادەیە، لەکاتی بیرکردنەوەو چوونەوە بەناخی خۆتدا، دەکرێ زەمەن لەخۆمان بکەینە دەرەوەو فڕێیبدەین ئینجا لەیەک کاتدا ڕابردوو ئێستەو ئایندە ببینین، لەوکاتەدا هەموو شتێک دەبێتە چاکەو هەموو شتێک کامڵ دەبێتو دەردەکەوێت، هەروەها هەموو شتێک دەبێتە براهما، بەم پێیە دەبینین هەر شتێک کە بوونی هەیە "چاکە"، مەرگیش وەک ژیانو گوناهیش وەکو پاکیزەیی پەسەندو قەبوڵکراوە، پاشان دەبینین هەموو شتێک لەجێگەی خۆیدا چاکەیەو هەموو شتەکان تەنها پێویستیان بە ڕەزامەندی منو تێگەیشتنی منو گونجاندنە لەگەڵ مندا، ئەوکاتە هەموو شتەکان لەگەڵ مندا سازگارنو دەگونجێنو ئازارم پێناگەیەنن، لەڕۆحو جەستەی خۆمەوە فێری

ئەمانەش بووم، تەنانەت فێری ئەوەش بووم کە ئەزموووونکردنی گوناه کاریکی پێویستە، من پێویستم بە شەهوەت بوو، دەبوایە ماڵو سەروەت بەدەست بهێنمو نەفرەتکردنێکی نابەجێ ئەزمونبکەمو تێبیگەم، فێربووم لە بەرامبەر ئەوانەدا بەرگری نەکەم تاوەکو بتوانم جیهانم خۆشبوێتو لەوەش زیاتر ئەو کارانە بەراورد نەکەم بە جیهانی خەیاڵیو تێڕوانینێکی وەهمیم هەبێت بۆ کەماڵو بەبێ بنەمایەک دەسبەرداری هەموو ئەو شتانەبم کە بەو شێوەیەی خۆیان هەن یاخود خۆشمبوێنو وابەستەبم پێیانەوە، ئەی گۆڤیندا ئەمانە جۆرە بیرکردنەوەیەکن کەلەزەینی مندان.

سیدهارتا چەمایەوەو لەسەر زەوی بەردێکی هەڵگرتو خستیە سەر لەپی دەستی، پاشان وتی" ئەمە بەردەو بەدرێژایی ماوەیەکی دیاریکراوی کات دەبێت بە خاک، پاشان لە خاکیشەوە بەشێوەی ڕوەکو ئاژەڵو مرۆڤ سەر لە نوێ پەیدا دەبێتەوە، پێشتر من تەنها دەموت ئەم بەردە جگە لە بەردێک شتێکی تر نیەو نابێتە خاوەنی بەهایەکو پەیوەستە بە جیهانی "مایا" وە بەڵام دەشێ لە بازنەی وەرچەرخاندا، ئەویش بتوانێت ڕۆژێ لە ڕۆژان ببێت بە مرۆڤ، یان بەڕۆح، بەم پێودانگەیە کە هەڵگری بەهاوگرنگیە، بەڵێ... پێشتر من بەم شێوەیە بیرم دەکردەوە، بەڵام هەنوکە پێم وایە کەئەم بەردە، بەردەو لەهەمان کاتیشدا هەم ئاژەڵەو هەم بودایەو هەم خوداشە، بەڵام لەبەر ئەمە حورمەتی ناگرم، مادام ئێستە شتێکەو پاشان دەگۆڕێت بۆ شتێکیتر، خۆشم ناوێت بەڵکو لەو لایەنەوە بەچاوی ڕێزەوە تەماشای دەکەم، کە عەیامێکە گشتگیرە لەناو هەموو شتەکانداو هەموو شتەکانیش پەیوەستدەبن پێیەوەو بەردەوام هەموو شتێکە، من لەبەر





ئەوە خۆشمدەوێ کە هەمیشە بەردێکە، چونکە ئەمڕۆو ئێستا لای من تەنها بەردە، من بەهاو واتای هەریەک لەهێڵو چاڵو چۆڵیەکانی لە ڕەنگە زەردوو خۆڵەمێشیەکانیدا دەبینمو هەروەها لەو دەنگەشەوە کەلە کاتی پێکدادانیدا لەگەڵ شتێکی تردا بەرگوێ دەکەوێ، یان ئەو وشکیو شێدارییە دەبینم کەلە ڕوخساری نیشتوە، کۆمەڵە بەردێک دەستدەکەون وەک ڕۆن یان وەک سابوونن، هەندێکیان لە شێوەی گەڵادا یا لەشێوەی زیخ نەخشێنراون، هەموویان جیاوازنو بەهەمان شێوەی خۆیان" ئۆم" دەپەرستن، هەریەکەیان براهمایەکە، لەگەڵ ئەوەشدا حاڵەتی سڕبوونی ئەو بەردە چ ڕۆنی بێت یان سابوونی، تەماشاکردنیی جوانە، ئەمەیە ئەو شتەی کەچێژم پێدەبەخشێتو لەبەرچاوم جوانەو شایستەی پەرستنە، چیتر لەو بارەیەوە شتێکی تر ناڵێم، وشەکان ناتوانن بەجوانی جۆری بیرکردنەوەکان ڕاڤەبکەن، وشە کەهاتە سەر زمان جیاوازی دروستدەکات، هەندێک دەشێوێنرێنو هەندێک کاڵفامانە دەناسرێن، هێشتا ئەم خواستەو ئارەزووە چێژم پێدەبەخشێت، ئەوشتەی کە لەدیدی کەسێکدا بەهاو حیکمەتێکی هەبێت، لەدیدی کەسێکیتردا پووچو بێ هودەیە.

گۆڤیندا بەبێدەنگی گوێی گرتبوو، پاش ماوەیەک بێدەنگی بە گومانێکەوە پرسی "بۆچی بەردت بەنمونە بۆمن هێنایەوە؟"

سیدهارتا وتی" لەم بارەیەوە مەبەستێکی تایبەتو دیاریکراوم نەبوو، لەوانەیە ئەم نمونەیە ئەوە نیشان بدات کەمن بەردو ڕووبارو تەواوی ئەو شتانەم خۆشبوێت کە دەیانبینینو دەتوانین شتێکیان لێوەفێربین، ئەی گۆڤیندا، من دەتوانم بەرد یا درەخت یا لەتەتوێکڵە دارێکم خۆشبوێت، ئەمانە شتەکانن دەبێت شتەکانمان خۆشبوێت،

بەڵام ناتوانین وشەکانمان خۆش بوێت، لەبەر ئەمەیە وانەو ڕێنماییەکانی لای من مایەی پووچی‌و بێ هودەیین، ئەمانە سەختی، نەرمی، ڕەنگ، گۆشەنیگا، بۆن‌و مەزەیەکیان نیە جگە لە وشەکان، لەوانەیە هۆکارەکەی ئەوەبێت کەتۆ لەبەدەستهێنانی ئاشتی‌و ئاسودەییدا دواکەوتوو دۆشداماوی، پێدەچێت تەنانەت لەپێناوی ڕزگاریشدا وشەگەلێکی زۆر سەر ڕێگای تۆیان گرتبێ، ئەی گۆڤیندا "سانسارا" و "نێرڤانا" تەنها دوو وشەن، نێرڤانا شتێک نیە، بەڵکو جیهانی نێرڤانا بوونی هەیە.

گۆڤیندا وتی " ئەی دۆستی من، نێرڤانا وشە نیە بەڵکو بیرۆکەشە"

سیدهارتا درێژەیدا بەقسەکانی "لەوانەیە بیرۆکەیەکیش بێت، بەڵام دۆستی ئازیز پێویستە ئەوە بڵێین کە لەنێوان بیرۆکەکان‌و وشەکاندا جیاوازیەکی ئەوتۆنیە، زۆر بەڕاشکاوانە ئەوەش بڵێین کە بەبڕوای من بیرۆکەکانیش گرنگیەکی ئەوتۆیان نیە، من زیاتر بڕوام بە گرنگی دانێکی زۆرە بە شتەکان، بۆ نمونە ڕۆژانێک لەم شوێنەدا پیاوێک هەبوو بەلەمەوانی دەکردو مامۆستای من بوو، ئەو کەسە پیاوێکی پیرۆزبوو، ساڵانێکی دوورودرێژ باوەڕی بەم ڕووبارە هەبوو، کە دەیبینی ڕووبار هەمیشە قسەی بۆدەکات، لە ڕووبارەوە شت فێردەبوو، ئەم ڕووبارە پەروەردەی دەکردو شتی فێر دەکرد، ساڵانێکی دوورودرێژ ئەم ڕووبارە بۆ ئەو لە خودایەک دەچوو، ئەو دەیزانی کە هەر نەسیمێک، هەر پەڵە هەورێک، هەر باڵندەو سوێسکەیەک، بەهەمان ئەندازەی ڕووبار پیرۆزو ئاسمانییەو بەهەمان ئەندازەی ڕووبار میهرەبانەو دەتوانێت شتت فێربکات، ئەو پیاوە مەزنە ئەو ڕۆژەی کە ڕۆشتەوە دارستان لەهەموو شتێک





تێگەشتبوو،وئاگادار بوو، ئەو بەبێ بوونی مامۆستایەکو بەبێ خوێندنەوەی کتێب لەمن‌و تۆ زیاتری دەزانی تەنها لەبەر ئەوەی باوەڕی بە ڕوبار هەبوو"

گۆڤیندا وتی" بەڵام ئایا تۆ ئەوەی کە ناوی دەنێیت (شتێک) ڕاستی تێدایە؟ ئایا خاوەنی خودێکی جەوهەریە؟ ئایا بەهەمان شێوە تەنها ڕواڵەت‌و وەهمی (مایا) نیە؟ ئایا ئەو بەردو درەختەی تۆ ڕاستیان تێدایە؟

سیدهارتا وتی "ئەمەش ئەوەندە نیگەرانم ناکات، ئەگەر ئەمانە هەموویان وەهم بن خودی خۆشم جگە لەوەهمێک شتێکی زیاتر نیم، ئەوانە هەموویان لە سروشتێکدان کەمن دەبمە خاوەنی، لەبەر ئەمەیە کە لە دیدی منەوە شایستەی ڕێزو خۆشەویستین، وەهەر لەبەر ئەم هۆکارەشە کەمن بەو ئەندازەیە خۆشم دەوێن، ئەمەش جۆرە بیروباوەڕێکە کەتۆ گاڵتەی پێدەکەیت‌و پێدەکەنی، ئەی گۆڤیندا.. بە بڕوای من عەشق گرنگترین شتێکە کەلە جیهاندا هەیە، لەوانەیە لای بیرمەندە گەورەکان، توێژینەوە لەجیهان‌و باس لە نەفرەتکردنی عەشق گرنگتربێت، بەڵام لای من، گرنگترین شتێک لەناو هەمووشتەکاندا ئەوەیە کە جیهانمان خۆشبوێت، نەک نەفرەتی لێبکەین، نەک ئاوا یەکتر ناشیرین کەین، بەڵکو دەبێت عەشق‌و ستایش‌و حورمەتمان هەبێت بۆ خۆمان‌و جیهان‌و هەموو بونەوەرەکان.

گۆڤیندا وتی "لەمە تێدەگەم، بەڵام ئەمە ئەو شتەیە کە بودای حەکیم‌و بێ هاوتا بەوەهمی دادەنا، ڕێنمایی‌و ئامۆژگاریەکانی ئەو تەنها دەربارەی چاکەکاری‌و هاودەردی‌و سەبرکردن بوو، لەبارەی عەشقەوە شتێکی نەدەگوت، ئەو پیاوە گرفتار بوونی عەشقی دنیایی

لەئێمە حەرامکردبوو.

سیدهارتا لەوکاتەدا زەردەخەنەیەکی نورانی کەوتە سەر ڕوخساری‌و وتی" ئەی گۆڤیندا، ئەمە دەزانم، لێرەدا خۆمان لەناو شەڕی وشەکاندا دەبینمەوە چونکە ناتوانم نکۆڵی لەوە بکەم کە قسەکانی من دەربارەی عەشق بەڕواڵەت لەگەڵ ڕێنمایی‌و ئامۆژگاریەکانی گۆتامادا جیاوازن، هەربۆیە لە وشەکان بێزارم چونکە دەزانم کە ئەو جیاوازیەش جگە لەوەهمێک شتێکیتر نیە، بەتایبەت لەو لایەنەشەوە لەگەڵ گۆتاما دا تەباو هاوڕام، چۆن دەبێت ئەو ئاگای لەعەشق نەبێت؟ لەکاتێکدا ئەو هەموو خۆفرۆشی‌و گۆڕانە ئەخلاقی‌و تایبەتیەکانی مرۆڤی دەزانی‌و لێیان تێدەگەیشت، لەهەمان کاتیشدا ئەوەندە مرۆڤایەتی خۆشدەویست کەتەمەنێکی دوورودرێژی تەرخانکرد بۆ کۆمەکو ڕێنمایی‌و ئامۆژگاری مرۆڤ، چۆن دەبێت ئەو بێ ئاگابێت لەعەشق؟ تەنانەت لای ئەم مامۆستا مەزنەش، کردار زیاتر لە گوتار گرنگتر بووە، بە بڕوای من، ژیان‌و کردارەکانی ئەو، مەزن‌و بالاتربوون وەک لە بیرو بۆچوون‌و باوەڕەکانی، من گەورەیی‌و مەزنی ئەو لە قسەکانیدا یان لەبیر کردنەوەیدا نابینم، بەڵکو مەزنی ئەو لەژیان‌و ڕەفتارو کردارەکانیدا دەبینم.

هەردوو پیرەمێردەکە ماوەیەک بەبێدەنگی دانیشتن، لەوکاتەدا گۆڤیندا خۆی ئامادە دەکرد بۆ ڕۆشتن‌و وتی "ئەی سیدهارتا، سوپاس بۆ تۆ، کەشتێکت پێ وتمەوە لە بیروبۆچوونی خۆت، هەندێک لەو بیرکردنەوانە زۆر گەورەو بەنرخن، ناتوانم بەیەکجار لەهەمویان تێبگەم، بەهەرحاڵ زۆر سوپاست دەکەم، هیوای ڕۆژگارێکی پڕخۆشی‌و ئاشتیت بۆ دەخوازم "





هەروەها لە ناوەوە بیری دەکردەوەو پێیوابوو سیدهارتا پیاوێکی سەرسوڕهێنەرەو بیرکردنەوەی سەیری هەیەو باس لەشتی غەریب دەکات، بیروبۆچوونەکانی شێتانەو سەیروسەمەرەن، بیروبۆچوونەکانی ئەو پیاوە بێ هاوتایە چەند جیاوازە لەگەڵ سیدهارتادا، بیروبۆچوونەکانی ئەو هەموویان ڕوون‌و ئاشکراو بێگەردن‌و بەئاسانی دەیانخاتە ڕوو شایستەی ئەوەن لێیان تێبگەیت‌و شتی سەیرو گاڵتەجاڕی لەخۆناگرن، هەروەها دەست‌و قاچ‌و چاوەکانی سیدهارتاو چۆنیەتی هەناسەدانی، ناوچەوانی، زەردەخەنەکەی، سڵاو کردن‌و ڕەفتارەکانی بە شێوەیەکیتر منیان خستە ژێر کاریگەری خۆیانەوە، لە دوای ئەو بوودا تاقانەیە کە گەیشت بە نێرڤانا، کەسێکی ترم نەبینیوە وەکو سیدهارتا کە ئەم جۆرە هەستکردنەی لەمندا وروژاندبێ، ئەوە پیاوێکی پیرۆزەو پێدەچێت بیروبۆچونەکانی غەریب‌و قسەکانی سەرسوڕهێنەر بن، بەڵام لە نیگاکانیدا، لە پێست‌و پەیکەریدا نورێکی پاک، ئارامی‌و شادمانی، میهرەبانی‌و پاکیزەیی دەبارێت، لەدوای گۆتامای حەکیمەوە ئەم حاڵەتانەم لەکەسی تر نەبینیوە.

گۆڤیندا سەرگەرمی ئەو جۆرە بیرکردنەوانە بوو، لەدڵێدا غەوغایەک بەرپابوو، سوپاسی پڕ لە میهرو خۆشەویستی سیدهارتای کردوو، لە بەرامبەریدا ئەوپیاوەش کەبێدەنگو بێ جوڵە دانیشتبوو سوپاسێکی پڕ لە میهرو گەورەیی گۆڤیندای کردو پاشان گۆڤیندا وتی" سیدهارتا، ئەوەیە کە ئێمە پیر بووین، پێدەچێت لەم ژیانەدا یەکتر نەبینینەوە، ئەی دۆستی ئازیز ، دەبینم تۆ ئاشتی‌و ئارامیەکی جوانت بەدەستهێناوە، ئەوەش دەزانم کەمن ئەوەم بەدەست

نەهێناو، ئەی دۆستی من قسەیەکی تر بکە، شتێک کەبتوانم ببینم، شتێک کە تێبگەم، شتێکم بدەرێ کە هاوکاری ئەم ڕێگایەم بکات، ئەی سیدهارتا ڕێگاکەی من زۆر سەختو تاریکە".

سیدهارتا بێدەنگ بوو، بەزەردەخنە ئارامو پڕ لە خۆشەویستیەکەی خۆی، سەیری گۆڤیندای کردو گۆڤینداش بەتاسەو ئەوینێکی زۆرەوە لە ڕوخساری ئەو ڕامابوو، ماندووبونو زەحمەتێکی بەردەوامو شکستێکی هەمیشەیی لەڕوخساری گۆڤیندادا خوێندەوە، سیدهارتا کە ئەوەی بینی پێکەنی... پێکەنینەکەی لە گوێی گۆڤیندادا زرنگایەوە، سیدهارتا وتی" وەرە نزیکی منەوە، وەرە.. نزیکتربەرەوە، ئەی گۆڤیندا، وەرەو ناوچەوانی من ماچ بکە"

گەرچی گۆڤیندا سەری سوڕمابوو، بەڵام بە عەشقێکی پڕ و هەستو سۆزێکەوە کەپێناسە نەدەکرا، فەرمانەکەی سیدهارتای بەجێ هێنا، ڕا وەستاو لێوی خستە سەر ناوچەوانی سیدهارتاو ماچیکرد، ئەوەی ئەو وتی جێبەجێ کرد، شەوقو ڕەونەقێکی سەرنج ڕاکێش لەڕوخساری گۆڤیندادا دەرکەوت، لەوکاتەدا خۆی خستە پەناگای قسەکانی سیدهارتاو بێ هودە هەوڵیدا مانای زەمەن فرێبداتو پێکەوە وێنای سانسارا و نێرڤانا بکات، لەوکاتەدا تەنانەت لەخۆیدا هەستی بە بچوکیەک کردبوو لەبەردەم قسەکانی دۆستەکەیدا، بەڵام لەگەڵ عەشقێکی قوڵو ڕێزێکی تەواو کە هەیبوو بۆ سیدهارتا لەجەنگو ململانێدا بوون، لەوکاتەدا حاڵەتێک لە گۆڤیندادا ڕویدا چیتر ڕوخساری دۆستەکەی، سیدهارتای نەبینیەوە، بەڵکو لەبری ئەو ڕوخساری ترو ڕوخساری جۆراوجۆری تری بینی، لەو ڕوخسارانەی کەهاتوونو لەناوچوون، لەهەمان کاتدا هەموویان لەناو ئەودا بوونو





دەگۆڕانو بەشێوەی تازە بەرجەستە دەبوونەوە، هەموو ئەو ڕوخسارانە سیدهارتا بوونو دەبوونەوە بە سیدهارتا، شێوەی ماسی، ماسی ( کارپ ) ی بە دەمێکی گەورەو فراوانەوە دەیبینی، بینی ماسیەک لە حاڵەتی مەرگدا بوو بەچاوی زەقەوە سڕبووەوە سەیری ئەوی دەکرد، ڕوخساری سورو چین چینی منداڵێکی بینی کە خەنجەرێکی لە سینەی پیاوێک دەچەقاند، ئەوەشی بینی کە تاوانبارێک بەچۆکدا هاتووەو سەری بە تیغی جەللاد دەسپێرێت، پەیکەری ژنو پیاوی بێ شوماری بەڕوتی بینی لە مەینەتو پەرێشانی عەشقدا بوون، سەری ئاژەڵەکان، بەرازوو تیمساحو فیلو گا و باڵندەکانی بینی کریشنا و ئاگنی لەو شوێنەدا بەدیکرد، بینی هەموو ئەو سیماو ڕوخسارانە بە هەزاران شێوە بەستراون بە یەکەوەو کۆمەکی یەکتریان دەکردوو یەکتریان خۆشدەویستو نەفرەتیان لە یەکتر دەکردوو لەناو دەچوونو سەر لەنوێ لەدایک دەبوونەوە، هەریەک لەوانە شتێکی فانیو شەهوانیو نمونەیەکی ترسناک بوون لەو شتە تێپەڕانە، بەڵام هیچ یەکێکیان نەمردن، بەڵکو تەنها گۆڕانیان بەسەردا دەهات، سەرلەنوێ دەهاتنەوە جیهانو لەدایک دەبوونەوە، ڕووخسارێکی تازەیان هەڵدەبژارد، ئەوەی کە لەنێوان شێوەیەکو شێوەیەکی تردا بوونی هەبوو، تەنها زەمەن بوو، هەموو ئەو ڕوخسارو سنورانە مانەوەو جوڵەیان تێکەوتەوە، سەرلەنوێ گەڕانەوەو کەوتنەوە مەلەکردن بەتەنیشت یەکترا تێپەڕین، لەسەر ئەو هەمو شتە ناسکو ناڕاستانەو لەهەمانکاتیشدا بوونیان هەبوو، وەک توێژاڵێکی سەهۆڵی، وەک بەرگی سەدەف یان وەک دەمامکێک لەئاوی تەنکدا دامرکابووەوە، ئەو توێژاڵە تەنکە ڕووخساری نورانیو پڕ

خەندەی سیدهارتا بوو، کە لەوکاتەدا گۆڤیندا لێوەکانی خۆی لێدەخشاندو ماچی دەکرد، گۆڤیندا بینی کە ئەو خەندەیە لە دەمامکێک دەچوو، زەردەخەنەی یەکبوونو یەکیەتی لەسەر ڕوخسارە تێپەڕەکان، ئەو زەردەخەنەیەی کەلەسەر هەزاران مەرگو لەدایک بوونەوە ماوەتەوە، ئەو زەردەخەنەیەی سیدهارتا، بەتەواوی لە زەردەخەنە هەزار جۆرەکەی گۆتامای دەچوو، بەو ئەندازەیە ئارام، جوان، پڕنهێنی، ناکاریگەر، درەوشاوە بوو، هەروەها گاڵتە ئامێزو حەکیمانە بوو، کە لەوانەیە گۆڤیندا سەدان جار بەترسو حورمەتەوە سەیری کردبوو، گۆڤیندا دەیزانی، کەئەو پیاوە بێ هاوتاو مەزنەش هەربەم شێوەیە زەردەخەنەی دەکرد.

گۆڤیندا بەبێ ئەوەی ئیتر هەست بەبوونی کات بکاتو بزانێت کە ئایا ئەم دۆزینەوە گەورەیە بەچرکەساتێک ئەنجامدراوەو پێی گەشتوە یان سەدان ساڵ درێژەی کێشاوە، ئایا سیدهارتایەک یان گۆتامایەک بوونی هەیە، بەم تیرە ئاسمانیە برینداربووەو چێژی لێ وەردەگرێت.

گۆڤیندا لەکۆتایی ئەو شادمانیەیدا، ماوەیەکیتر لەسەر ئەو ڕوخسارە پڕ لە سادەیەی سیدهارتا وەستاو ڕاما، کەماچی کردبوو لەو ڕوخسارەدا ئەو هەموو وێنەو سیماو ڕوخسارانەی ڕابردوو ئایندەی دیبوو، نیگەران بوو، ڕووخساری ئەو دوای ئەوەی ڕوخسارە دیارەکانی تێدا پەنهان ببوون ئاوێنەی جیهانی لێدەرکەوتبوو، چیتر نەگۆڕاو لە شادمانیو میهرەبانیەوە زەردەخەنەی دەکردوو، زەردەخەنەکانی زۆر گاڵتە ئامێزو جوان ببوون ، بەڵام زۆر لە زەردەخەنەکانی بوودای مەزن دەچوون، گۆڤیندا دووبارە سەری ڕێزی بۆ دانەواند، ئەو فرمێسکانەی بە گوناو ڕووخسارە پیرکەیدا





دابارین چیتر نەیدەتوانی ڕایانگرێت، لەژێر باری هەستو سۆزو عەشقێکی گەورەو حورمەتێکی پڕاوپڕدا دەستەوەستان ببوو، جارێکی تر سەری ڕێزو حورمەتی دانەواند لە بەرامبەریدا، پیاوێک سەری خستە سەر زەوی‌و بێ جووڵە دانیشتبوو زەردەخەنەکانی ئەو، کۆمەڵە شتێکی دەهێنایەوە یاد کەلە ژیانیدا خۆشی‌و لێبوردن نرخێکی زۆریان هەبوو لەلای‌و بەپیرۆزی دەزانین.

***